**(٤)**

**(رۆمان)**

# باوکە سێرگی

**لیۆن تۆلستۆی**

**وەرگێڕانی**

**ئەمین گەردیگلانی**





**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **باوکە سێرگی**
- **نووسینی:** لیۆن تۆلستۆی
- **وەرگێڕانی:** ئەمین گەردیگلانی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **پیتچنین:** محەمەد ئەمین شاسەنەم
- **بەرگ:** هۆگر سدیق
- **ژمارەی سپاردن:** ٦٧٦ لە٢٠١١ دراوەتێ
- **نرخ:** ٢٥٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم ٢٠١١**
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانەی رۆژهەڵات (هەولێر )**

**زنجیرەی کتێب (٥٧٤)**

MUKIRYANI

ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION



ماڵپەر: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

(١)

له سالانی چلەکاندا ڕووداوێک لە پترزبۆرگ قەوما کە هەمووانی تووشی سەرسوورمان کرد. پرەنس کاساتسکی[1]، فەرماندەری سوارەکانی هەنگی زرێپۆشان، کە لاوێکی جوانچاک بوو و هەمووان چاوەڕوانی ئەوە بوون بە زووترین کات ببێتە ئاجوودانی تایبەتی تێزار نیکۆلای یەکەم و ڕێگایەکی پرشنگدار بگرێتە بەر، مانگێک بەر لە زەماوەندی لەگەڵ دەزگیرانەکەی، کە کچێکی زۆر جوان و شۆخوشەنگ بوو و نەدیمەی ژنی ئیمپراتۆر بوو و ئیمپراتۆرژن[2] زۆری خۆشدەویست، بە شێوەیەکی کتوپڕ، وازی لە خزمەتی سەربازی هێنا و پێوەندیی لەگەڵ دەزگیرانەکەی پساند و مڵکێکی چکۆڵەی هەبوو ئەویشی دا بە خوشکەکەی و چوو بۆ پەرستگە و لەوێ بوو بە ڕاهیب. ئەم ڕووداوە بۆ کەسانێک کە لە هۆکاری سەرداپۆشراوی ئەو بێئاگا بوون زۆر بێمانای دەنواند، بەڵام بۆ پرەنس ستیپان کاساتسکی خۆی هێندە کارێکی سروشتی بوو بە خەیاڵیشیدا نەدەهات کە جگە لەوە چارەیەکی تری هەبێ.

1- Kassatsky

٢- مەبەست ژنی ئیمپراتورە.



کاتێک باوکی پرەنس ستیپان کاساتسکی، کە سەرهەنگی گاردی ئەرتەش بوو، کۆچی دوایی کرد، کوڕەکەی تەمەنی دوازدە ساڵان بوو. ئەگەرچی دایکی زۆر بە دژواری دەیتوانی دووریی کوڕەکەی تامڵ بکات، بەڵام ڕازی نەبوو وەسیەتی مێردە خوالێخۆشبووەکەی بەجێ نەهێنێ کە گوتبووی کوڕەکە لای خۆی ڕانەگرێ و بینێرێ بۆ فێرگەی سەربازی. بۆیە ڕێزی بۆ وەسیەتی مێردەکەی دانا و ناردی بۆ فێرگەی سەربازی. خۆی و ڤارڤارای کچیشی کۆچیان کرد بۆ پترزبۆرگ تاکوو لە کوڕەکەی نزیک بێ و ڕۆژانی پشوودان چاوی پێی بکەوێ.

کوڕە زۆر زیرەک و خاوەن مرخ و توانایی و لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لەخۆبایی بوو. هەر بە هۆی ئەو دەمار و لووتبەرزییەوە لە وانە زانستی و بەتایبەت ماتماتیکدا کە زۆری حەز لێی بوو، هەروەها لە مەشقە سەربازی و سوارکارییەکاندا لە نێوان هاوپۆلەکانیدا سەرباشقە بوو. ئەگەرچی لە ڕادە بەدەر کەڵەگەت بوو، بەڵام ئەو کەڵەگەتییە نەدەبووە کۆسپ و تەگەرە لە سەر ڕێی چالاکییەکانی و دەموچاوێکی زۆر جوان و ناسکی هەبوو. ئەگەر ئاڵەتی و توندە تەبیعەت نەبوایە، لە باری خدە و ئاکاریشەوە بێوێنە و گەنجێکی نموونە دەبوو. خۆی لە قەرەی خواردنەوە و ڕابواردن نەدەدا و زۆر ڕاستوێژ و ئاکار جوان بوو.

تەنیا شتێک کە دەبووە هۆی ئەوەی نەتوانێ لە هەموو لایەنێکەوە نموونە بێ، هەر ئەو تووڕەیی و زووهەڵچوونەی بوو کە وای

لێکردبوو نەتوانێ ددان بە خۆیدا بگرێ و ئەوی کردبووە ئاژەڵێکی دڕ و ترسناک. ڕۆژێک زۆری نەمابوو خوێندکارێک لە پەنجێرەوە فڕیداتە خوارێ کە بە چاوی تەشەر و تەوسەبزەوە لە بەردیلە سروشتییەکانی ئەوی ڕوانیبوو. جارێکی دیکەش خەریک بوو بە جارێ داهاتووی خۆی ڕەش بکات: دەورییەکی پڕ لە کۆتلێتی دابوو بە دەموچاوی ئەفسەری ڕاهێنەردا و هۆمەنی بۆ بردبوو و دەڵێن زۆریشی لە ئەفسەرەکە دابوو، چونکە ئەفسەری ڕاهێنەر حاشای لە قسەکەی خۆی کردبوو و درۆی کردبوو. ئەگەر لەو کاتەدا بەرپرسی فێرگە نەهاتبایە و مەسەلەکەی پووشبەسەر نەکردایە و ئەفسەری ڕاهێنەری نەبردایەتە دەرێ و دوایی بە کێشەکە نەهێنایە، پڕەنس دەرەجەی لێ دەسەندرایەوە و هەتا پلەی سەربازێکی ئاسایی دەهاتە خوارێ.

ستێپان کاساتسکی لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بە دەرەجەی ئەفسەری گەیشت و توانیی بچێتە هەنگی گاردەوە کە تایبەتی خانەدانەکان بوو. ئیمپراتور نیکۆلای پاولۆڤیچ، کە ئەوی لە کاتی کۆلێژی ئەفسەرییەوە دەناسی، لە هەنگەکەشدا بە چاوی ڕێزەوە لێی دەڕوانی، بە جۆرێک کە پێشبینی دەکرا پلەی ئاجوودانی تایبەتی پێ بدرێ و کاساتسکی خۆشی زۆری ئەو مەقامە بە دڵ بوو، ئەوەش نەک لەبەر ناو و دەسەڵات و سەرامەبوون، بەڵکوو زیاتر بەو هۆیەی کە ئەشق و خۆشەویستییەکی بەتین لە دڵیدا بوو، بەڵێ، بەڕاستی ئەوینێکی گەرموگوڕ هەر لە زەمانی کۆلێژی ئەفسەرییەوە دەرهەق بە نیکۆلای پاولۆڤیچ لە دڵیدا بوو.



هەرکاتێک کە نیکۆلای پاولۆڤیچ دەهات بۆ زانکۆی ئەفسەری ـ کە زیاتر بە سواری دەهات ـ و بە قەڵافەتی لەبار و کەڵەگەت و سینگی پان و دەرپەڕیو و بە یۆنیفۆرمی نیزامییەوە و لووتی قەڵەنگی و باریکی لە سەر سمێڵی و خەتی ڕدێنی سەر لاجانگی کە زۆر جوان و لەبەردڵان بوو، بە هەنگاوی قورس و قایم و شێرانە دەهات و بە دەنگی بەرز وەڵامی دروودی خوێندکارانی دەدایەوە، ئەشقێکی ئاگرین لە سینگی کاساتسکیدا دەبزووت و ئەو سۆز و ئەشقە ڕاست دەتگوت ئەو هەستەیە کە بۆ یەکەم جار لەگەڵ دەزگیرانەکەی قسەی کرد و دڵی وەک گڕپڕژێن لە ناخەوە دەستی کرد بە قاڵ بوون و هەڵچوون و ئاراوقارای لێ هەڵگرت. بەو جیاوازییەوە کە سەودای ئەوینی نیکۆلای پاولۆڤیچ لە دڵیدا بەتینتر بوو: کاساتسکی دەیویست ئەشقی بێسنووری خۆی و ئامادە بوون بۆ گیانفیدایی لە بەرپێی ئەودا نیشان بدا و نیکۆلای پاولۆڤیچ دەیزانی ئەو کەفوکوڵی خۆشەویستییە حەز و تاسەی زیاتر لە ناخیدا دەجووڵێنێ و بە ئانقەست کارێکی دەکرد زیاتری بۆ ئەو کارە هان بدا و خۆی لە بەرچاوی شیرین دەکرد. ئەو لەگەڵ خوێندکاران یاریی دەکرد و ئەوانی لە دەوری خۆی کۆ دەکردەوە و قسەی لەگەڵ دەکردن، هێندێ جار بە شێوەیەکی منداڵانە و برێ جار دۆستانە و هێندێ جاریش بە شکۆیەکی شاهانەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردن. ئەو کاتەی کە کاساتسکی هێشتا لە زانکۆی ئەفسەری بوو، دوای کێشەکەی لەگەڵ ئەفسەری ڕاهێنەر، کە نیکۆلای پاولۆڤیچ وەڕووی خۆی نەهێنابوو، ڕۆژێک کە ئیمپراتۆر

هاتبوو بۆ چاوپێکەوتنی خوێندکاران، کاساتسکی خۆی لێ نزیک کردبۆوە. نیکۆلای پاولۆڤیچ بە شێوەیەکی ئەکتەرانە ڕۆڵی گێڕابوو، بە ڕوویەکی گرژەوە خۆی لێ لادابوو و بە لالووتییەوە قامکی بۆ لای ڕاداشتبوو و لەگەڵ ئەوەی دوور دەکەوتەوە گوتبووی: «خۆ دەزانی من ئاگام لە هەموو شتێکە، بەڵام هێندێ شت هەیە دەمەوێ نەزانم.» ئاماژەشی بە دڵی کردبوو و گوتبووی: «بەڵام هەموو شتێک لێرەدا تۆمار دەبێ.»

بەڵام دواتر، کاتێک ئەو خوێندکارانەی تازە بووبوونە ئەفسەر لەگەڵی بەرەوڕوو بوون و هاتبوو بۆ یەکەکەیان ئیتر ئاماژەی بەو کێشەیە نەکردبوو و وەک هەمیشە دووپاتی کردبۆوە کە ئەوان هەموویان دەتوانن ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ بکەن و داوای لێکردن کە بە ڕاستی و دڵپاکییەوە خزمەت بە ئەو و بە وڵاتەکەیان بکەن. بەڵێنیشی دا کە هەمیشە دۆست و هاوڕێی نزیکی ئەوان دەبێ. ئەو قسانە وەک ڕابردوو کاریگەرییەکی قووڵی لە سەر دڵی هەموویان دانابوو، بەڵام کاساتسکی لەگەڵ وەبیر هاتنەوەی ماجەراکەی ڕابردوو دەستی کردبوو بە گریان و سوێندی خواردبوو کە بە گیان و دڵ خزمەت بە وڵات و ئیمپراتۆری خۆی دەکات.

کاتێک کاساتسکی چووە هەنگی گاردەوە، دایکی و کچەکەی سەرەتا چوون بۆ مۆسکۆ و لەوێشەوە گەڕانەوە بۆ ملکەکەیان لە گوند. کاساتسکی نیوەی ملکەکەی خۆی بە خوشکی بەخشی و ئەوەی بۆ



مابۆوە و ئەوەندە دەبوو کە بۆ ژیانی ڕەنگینی ئەفسەرێکی گارد بەسندە بکات.

کاساتسکی بە ڕواڵەت یەکێک لە ئەفسەرانی گارد بوو، وەکوو زۆربەی ئەفسەرەکانی تر گەنج و لە هەموو بارێکەوە ڕووناک و فیکر و زیکری تەنیا بەدەستهێنانی ناوبانگ و پێشکەوتن بوو. بەڵام گۆڕانێکی قووڵ و پڕ گرێوگۆڵ خەریک بوو لە ناخیدا سەری هەڵدەدا. ئەم گۆڕانە لە دەورانی منداڵییەوە لە وجوودیدا شکڵی گرتبوو و هەر جارەی بە شێوەیەکی جۆراوجۆر خۆی دەنواند و لە ڕاستیدا هەقیقەت تەنیا شتێک بوو. بەو مانایەی کە ئەوینێک لە دڵیدا بڵێسە بکێشێ کە لە هەموو کارێک و لە هەموو بوارەکانی ژیاندا سەرکەوتوو بێ و بە کەماڵ بگا. دەیویست بە هەر نرخێکە ببێتە هۆی سەرسووڕمان و سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕابکێشێ. بۆ وێنە لە وانەکانی زانکۆ یان مەشقە سەربازییەکانیدا هێندە بە دڵ تێوەدەچوو کە هەمووان ئافەرەمی پێ بڵێن و بە نموونەی بزانن. کاتێک بە ئامانجێک دەگەیشت ئامانجێکی دیکەی هەڵدەبژارد. بۆیە لە بواری زانستدا باشترین خوێندکار بوو. لە زمانی فەڕەنسیدا چونکە جارێک تووشی هەڵە بوو، بڕیاری دا ئەو زمانەش وەک زمانی ڕووسی فێربێ و ئاخری فێری بوو. پاشان بۆ فێر بوونی شەترەنج زۆری هەوڵ دا و هێشتا نەبووبووە ئەفسەر، بوو بە شەترەنجبازێکی نموونە.

جگە لە ڕیسالەتی گشتیی خۆی لە ژیانیدا، کە خزمەتکردن بە تێزار و وڵات بوو، هەمیشە ئامانجێکی تریشی هەبوو کە بە دوایدا دەچوو و

ئەو ئامانجەش ئەگەرچی شتێکی چووکە بوو، ئەو تەواوی توانای خۆی بۆ گەیشتن بەو ئامانجە تەرخان دەکرد و بۆ ئەوە زیندوو بوو کە دەستی پێی ڕابگا. بەڵام هەرکە دەستی پێی ڕادەگەیشت ئامانجێکی تر لە مێشکیدا سەری هەڵدەدا و جێگەی ئامانجەکەی پێشووی دەگرتەوە. هەر ئەو خولیای بێهاوتا بوونە ـ هەوڵدان بۆ شتێک کە ببێتە هۆی ناو دەرکردن و نموونە بوونی ـ تەواوی ژیانی بە خۆیەوە گرێ دابوو. بەو شێوەیە کاتێک بوو بە ئەفسەر، ئامانجی ئەوە بوو کە لە کاری نیزامیی خۆیدا بە باڵاترین پلەی کەماڵ بگا. لە ماوەیەکی کورتیشدا بوو بە ئەفسەری نموونە. ئەگەرچی عەیبە گەورەکەی هەروا بەبێ چاکسازی مایەوە و نەیدەتوانی ئاڵەتی بوون و زوو دەرهەڵبوونی خۆی مەهار بکات و لەو خووخدەیەی خۆی وەڕەز بوو، چونکە ئەو خدەیە تووشی هێندێ کاری ناپەسەندی دەکرد و زیانی بۆ پێشکەوتن و سەرکەوتنەکانی هەبوو.

پاشان چونکە لە کاتی ئاخافتن لە کۆڕێکدا بۆی دەرکەوت لە بواری زانیاریی گشتیدا کورتی دێنێ، بڕیاری دا ئەو کەموکوڕییەی چارەسەر بکات و هێندەی متاڵاکرد کە بە کاوی دڵی گەیشت. دوای ئەوە ویستی لە کۆڕی گەورەکاندا بدرەوشێتەوە و هاتە سەر ئەوەی شێوەی سەما کردنەکەشی بگۆڕێ و زۆری نەخایاند کە زۆر جوان و هونەرمەندانە سەمای دەکرد و بۆ کۆڕی سەمای ئەشراف و گەورەماڵان بانگهێشتن دەکرا و هەروەها بۆ زۆربەی شەونشینییە هەڵبژاردەکانی تێزاری یەکەم کە تایبەتیتر بوو، بواری بۆ ڕەخسا. بەڵام ئەوانە هیچکام وا



نەبوون دڵی لێیان ئاو بخواتەوە. خووی بەوە گرتبوو کە لە هەموو شوێنێک یەکەم بێ و لەو جۆرە کۆڕانەدا هەتا مەقامی یەکەم مەودایەکی زۆری هەبوو. کۆمەڵگای گەوران لەو سەردەمەدا، بە بۆچوونی من هەمیشە و لە هەموو جێیەک، لە چوار دەستە پێکدەهات. یەکەم ساماندارانی وابەستە بە دەربار بوون. دووهەم ئەو کەسانەی دەوڵەمەند نەبوون بەڵام لە نەجیمزادە پلە یەکەکان و وابەستە بە دەربار بوون. سێهەم ئەو دەوڵەمەندانەی هەوڵیان دەدا خۆیان لە مەقاماتی دەربار نزیک بکەنەوە. چوارەم کەسانێک کە نە ساماندار بوون و نە دەرباری، بەڵام هەوڵیان دەدا بێنە نێو ئەو دوو دەستەیەوە. کاساتسکی لەو دوو دەستەی یەکەم نەبوو، بەڵام دوو دەستەکەی دوایی خۆشیان دەویست و لە کۆڕەکانی خۆیاندا پێشوازییان لێدەکرد. ئەو لە سەرەتای هاتنە نێو کۆمەڵگای گەورانەوە هەوڵی دەدا لەگەڵ خاتوونێکی خانەدان کەینوبەین ساز بکات و زۆر خێرا و بە سانایی کە چاوەڕوانیی نەدەکرد، لەگەڵ کچێکی شۆخوشەنگ ئاشنا بوو. بەڵام زۆر زوو بۆی دەرکەوت ئەو کۆڕانەی ئەو لێیان میوان دەبوو، هیچیان پلە یەک نین و کۆڕی لەوە باڵاتریش هەیە و ئەگەرچی لەو کۆڕە باڵایانەدا کە وابەستە بە دەربار بوون وەریاندەگرت، بەڵام لەوێ پینەی لاقنگ بوو. بە ئەدەب و مێهرەبانییەوە قسەیان لەگەڵ دەکرد، بەڵام بە هەڵسوکەوتیاندا دیار بوو کە ئەو لە خۆیان نازانن و بڕیاری دا لە نێو ئەوانیشدا خۆمانە بێ. بۆ ئەو کارەش دەبوو یان ببێتە ئاجوودانی تێزار (کە هەمیشە چاوەڕوانی ئەو شانازییە بوو) یان ببێتە زاوای یەکێک لەو

بنەماڵانە. ئەوەش بڕیارێک بوو کە دای و کچێکی زۆر جوان و شۆخوشەنگی هەڵبژارد کە لەو بنەماڵانەی وابەستە بە دەربار بوو. ئەو کچە نەک هەر لەو کۆڕانەدا کە ئەو حەزی لێدەکرد و دەیویست ئەندامێکی بەرز و خاوەن کەسایەتی بێ و بە چاوی خۆمانە لێیان دەڕوانی، بەڵکوو کەسانی زۆر پایەبەرزیش هەوڵیان دەدا سەرنجی بۆ لای خۆیان ڕاکێشن. ئەو کچە ناوی کۆنتس کۆرتکۆڤا[3] بوو. بەڵام کۆرتکۆڤا تەنیا لەبەر خۆش کردنی ڕێگای داهاتووی بۆ وەدەست هێنانی دڵی ئەو هەوڵی نەدەدا. کچێکی زۆر جوان و دڵڕفێن بوو و کاساتسکی زۆر زووی ئەویندار و شەیدای بوو. کچە لە سەرەتاوە بە شێوەیەکی ساردوسڕانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد بەڵام دواتر لە ناکاو هەموو شتێک گۆڕانی بە سەردا هات. کچە لەگەڵی دڵنەرم و مێهرەبان بوو، بەتایبەت دایکی بە زۆری بانگهێشتنی دەکرد بۆ ماڵی خۆیان و ڕێزی لێ دەگرت.

کاساتسکی چووە خوازبێنیی کچە و پێیان دا. کاساتسکی لەوەی کە ئاوا بە ئاسانی دەستی بەو بەختەوەرییە ڕاگەیشت و هەروەها هێندێک لە تایبەتمەندییەکانی هەڵسوکەوتی دایک و کچ کە لە ڕوانگەی ئەوەوە نائاسایی دەنواند سەری سوورمابوو. ئەو لە ڕادە بەدەر ئاشقی کچە بووبوو و چاوانی ئاشق هەڵبەت نابینایە و هەر بەو هۆیەوە لەو شتە نەگەیشتبوو کە هەموو شارەکە دەیانزانی و لێی ئاگادار بوون، ئەویش ئەوە بوو کە دەزگیرانەکەی ئەو ساڵێک لەوە پێش گراوی تێزار بووە.

3- Korotkavo



(٢)

دوو حەوتوو بەر لەو ڕێکەوتەی کە بۆ زەماوەند لە بەرچاویان گرتبوو، کاساتسکی چووبوو بۆ ڤێلای ماڵی دەزگیرانەکەی لە تسارسکۆسلۆ[4]. مانگی مای بوو، هەواکەی گەرم بوو و ئەو لەگەڵ دەزگیرانەکەی لە نێو باخەکەدا پیاسەیان دەکرد. لەسەر ڕێگای نێو باخەکە و لە ژێر سێبەری زیزفۆنەکان لە سەر کورسییەک دانیشتن. مێری بە کراسی واڵی سپییەوە زۆر جوان بوو و سەرچاوەی ئەشق و جوانی و حەیا بوو. سەری داخستبوو و شان بە شانی دەزگیرانەکەی دانیشتبوو، جار جار سەری هەڵدێنا و چاوی لە کاساتسکی دەکرد کە لاوێکی باڵابەرز و جوانچاک بوو، ئەویش بە مێهرەبانی و قورساخییەکی زۆرەوە قسەی لەگەڵ دەکرد و زۆر بە پارێزەوە دەدوا و دەترسا وشەیەکی کاڵ یان ئاکارێکی نابەجێ خۆشەویستەکەی زویر بکات و سەفا و شادییە ئاسمانییەکەی لێ شلوێ بکات.

کاساتسکی لەو جیلە پیاوانەی ساڵانی چلەکان بوو (کە ئەمڕۆ ئیتر لە هیچ کوێ ئاسەواریان نەماوە) ئەوان ناپاکی کردن لە پێوەندیی جنسییان بە شێوەیەکی ئاگادارانە بۆ خۆیان بە ڕەوا دەزانی و بە شتێکی ناپەسەندیان دانەدەنا، بەڵام چاوەڕوانی ئەوە بوون دەزگیرانەکەیان لە ئاوی شەو پاکتر بێ و سەرچاوەی شەرم و فهێت بێ. هەموو کچانی شوێنی خۆیان بە چاوە سەیر دەکرد و بە پێی ئەو باوەڕە

4- Tsarskoe celo

هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکردن. ئەم شێوە هەڵسوکەوتە لەگەڵ ئەو کێشە و بێبەندوبارییانەی کە پیاوان بۆ خۆیانی بە ڕەوا دەزانن زۆر زیانبار و نادروست بوو. بەڵام ئەم هەڵسوکەوتە لەگەڵ هەڵسوکەوتی لاوانی ئەمڕۆ کە هەموو کچان بە مێوینەیەک دەزانن کە جگە لە پەیدا کردنی نێرینەیەک بۆ خۆیان هیچ فکرێکی تریان نییە، زۆر جیاواز بوو. بە بڕوای من زۆریش بەکەڵک بوو، چونکە کچان کە ئاوا خۆیان بە ڕووگەی پیاوان دەزانی و هەوڵیان دەدا تا ڕادەیەک ببنە خودای ئەوین و پاکی و شایانی ئەو پەرستنە بن. بۆچوونی کاساتسکی سەبارەت بە کچان ڕاست بەو جۆرە بوو و بەو چاوەش لە دەزگیرانەکەی خۆی دەڕوانی. ئەو ڕۆژە ئەشق سەرتاپای داگرتبوو و ئەوین لە ناخیدا قوڵپی دەدا و ئەوینەکەشی بەری لە هەوەس بوو و بە دڵێکی نەرم و سەرنجێکی لێوڕێژ لە پەسن و ئەوینەوە دەیڕوانییە دەزگیرانەکەی و بە گەوهەرێکی پاک و بەنرخی دەزانی.

هەستا سەرپێ و هەردوو دەستی بە مشتووی شمشێرەکەیەوە گرت و بە قەڵافەتێکی زەبەلاحەوە بەرەوڕووی دەزگیرانەکەی ڕاوەستا و گوتی: «من ئێستا لەم کاتە پاکەدا خەریکە لە نوورانیترین بەختەوەری دەگەم کە بە نسیبی پیاوێک دەبێ.» بە بزەیەکی ئاوێتەی شەرمەوە گوتیشی: «ئەوەش ئێوەن، یانی ئێوەن کە ئەو بەختەوەرییەتان بە نسیب کردووم.»

ئەو لە قۆناخێکدا بوو کە هێشتا زۆر لەگەڵ دەزگیرانەکەی خۆمانە نەبووبوو کە پێی بڵێ «تۆ» چونکە لە ناخەوە خوی لە ئەو بە کەمتر



دەزانی. ئەویندارانە چاوی لە چاوی دەبڕی و ترسێک لە دڵیدا بوو کە نەیدەهێشت بەو فریشتەیە بڵێ «تۆ». ئاخری گوشاری بۆ خوی هێنا و دوای هێندێ خۆهەڵگوشین گوتی: «من لە سایەی ئەوینی... تۆوە خۆم ناسی و تێگەیشتم کە باشتر لەوەم کە بیرم لێ دەکردەوە.»

- من لە مێژە ئەوە دەزانم و هەر لەبەر ئەوەش هۆگرت بووم.»

بولبولێک کە لەو نزیکانە دەیخوێند و بە سروەیەکی نەرم گەڵای دارەکان دەشنینەوە.

کاساتسکی دەستی دەزگیرانەکەی گرت و لەگەڵ ئەوەی ماچی کرد فرمێسک لە چاوانیدا قەتیس ما. کچە لەڕێوە تێگەیشت کە قسەکەی شوێنێکی قووڵی لە سەر هەستی دەزگیرانەکەی داناوە. کاساتسکی ماوەیەک بە بەردەمی کچەدا هاتوچۆی کرد و بێدەنگ بوو، پاشان دیسان هاتەوە بۆ لای و لە تەنیشتی دانیشت.

- دەزانی چی... دەزانی... دەی جیاوازیی چییە، بێڵە با پێت بڵێم «تۆ». من کاتێک بە دوای ئەوینی تۆوە بووم دڵم بەری لە تەماح نەبوو. دەمویست لە نێو کۆمەڵگای گەوراندا پێوەندی و ئاشنایی دامەزرێنم. بەڵام دواتر کە تۆم بە باشی ناسی، بۆم دەرکەوت ئەوەی دەمویست لە چاو پاکی و گەورەیی تۆ زۆر بێنرخە. هیوادارم ئەو دانپیانانەی من نەبێتە هۆی ئەوەی دڵت گەرد بگرێ.»

کچە هیچی نەگوت و تەنیا دەستی لە سەر دەستی دانا.

کاساتسکی تێگەیشت کە مانای ئەو دەست لە سەر دەست دانانەی ئەوەیە کە: «نا، دڵم گەردی نەگرتووە!»

ـ بەڵێ، تو گوتت کە..

دوودڵ ما کە ئەو قسەیەی لە دڵیدا بوو و دەیویست دەریبڕێ لەوانەیە رووهەڵماڵدراوانە بێ. «... تو گوتت کە هۆگری من بووی. منیش باوەڕ بەو قسەیەت دەکەم. بەڵام... ببوورە.. من پێموایە تۆ جگە لەوە شتێکی ترت لە دڵدا بوو کە بووبووە هۆی دڵتەنگیت و ئازاری دەدای. ئەو شتە چی بوو؟»

کچە لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڵێ، ئێستا کاتی خۆیەتی. یان ئێستا یان هیچ کات. دەزانم رۆژێک هەر دەزانێ. بەڵام هێندە ئەوینداری منە و دەمپەرستێ دڵنیام دەستم لێ هەڵناگرێ. بەڵام ئەگەر لێم دڵمەند بێ و بەجێمبێڵێ... بەڕاستی زۆر ترسناکە!»

ئەویندارانە و بە چاوێکی پڕ لە خۆشەویستییەوە سەرنجی باڵای بەرز و بەهێز و نەجیبی دا. ئەو ئێستا ئەم لاوەی زۆر زیاتر لە نیکۆلای خۆشدەویست و ئەگەر نیکۆلای تێزار نەبوایە ئەوی لە گراوە پێشووەکەی خۆی خۆشتر نەدەویست.

ـ بروانە، حەیفە نێوانی ئێمە جگە لە راستی و پاکی شتێکی دیکەی تێدابێ. منیش بە ئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم کە هەموو شتێک بە ئێوە بڵێم. پرسیتان چیم لە دڵدایە. ئەو رازەی کە لە دڵمدا شاردوومەتەوە ئەمەیە کە من لە پێش ئێوەدا کەسێکی ترم خۆشویستووە.»

بە شێوەیەکی نەرمونیان و پڕ لە هەستی پاڕانەوە دەستی لە سەر دەستی کاساتسکی دانا.

کاساتسکی بێدەنگ بوو.



ـ حەز دەکەی بزانی ئەو کەسە کێ بووە؟ تێزار...

ـ دەی، ئێمە هەموومان ئەومان خۆشدەوێ. من باش دەتوانم بیهێنمە بەرچاوی خۆم کە ئێوە لە ئەنیستیتۆ...

ـ نا، دوای ئەنیستیتۆ... بەڵام دڵدارییەکەمان کەمی خایاند. من بە ئەرکی ویژدانیی خۆمی دەزانم کە پێت بڵێم...

ـ دەی، چی؟

ـ کە تەنیا دڵدارییەکی ئاسایی نەبوو.

بە دەستی دەموچاوی خۆی گرت.

ـ مەبەستتان چییە؟ یانی خۆتان دایە دەستی و دەستت لەگەڵ تێکەڵ کرد؟

کچە بێدەنگ ما.

ـ گراوی بووی؟

کچە هەروا بێدەنگ بوو و هیچی نەگوت.

کاساتسکی لە جێی خۆی هەستا. سپی هەڵگەڕا و رەنگی مردووی لێ نیشت، لەگەڵ ئەوەی شەویلاکەی دەلەرزی، بەرەورووی کچە راوەستا. ئێستا وەبیری هاتەوە کە رۆژێک نیکۆلای پاولۆڤیچ لە بڵواری نیۆڤسکی چاوی پێی کەوتبوو و بە مێهرەبانییەوە پیرۆزبایی لێ کردبوو.

کچە گوتی: «ئەیەڕۆ خودایە گیان، ستیڤا[1] من چیم کرد؟»

١- ستیڤا سووکەڵەناوی ستیڤانە بۆ خۆشەویستی.

ـ لێم نزیک مەبەوە. نزیک مەبەوە لێم. ئاخ چەندە ناخۆش و پڕشوورەییە!

ڕووی لێ وەرگێڕا و ڕۆیشتەوە بۆ ماڵێ. لە ماڵێ دایکی دەزگیرانەکەی چاوی پێی کەوت و پێی گوت: «پڕەنس، ئەوە چییە؟ دەڵێی بێتاقەتی!» بەڵام بە دیتنی ناوچاوانی گرژی کاساتسکی ڕەنگی هەڵبزرکا و بێدەنگ بوو.

ـ ئێوە دەتانزانی و دەتانویست ناوی ڕەشی خۆتان بە ناوی من سپی بکەنەوە.

مشتی قووچاند و لەگەڵ ئەوەی بەرزی کردەوە گوتی: «ئاخ ئەگەر تۆ و کچەکەت ژن نەدەبوون...» ئەوەی گوت و وەرسووڕایەوە و بە هەڵەداوان ڕۆیشت.

ئەگەر دڵداری دەزگیرانەکەی لە خەڵکی ئاسایی بوایە، حەتمەن دەیکوشت. بەڵام بۆ چارەڕەشیی ئەو، ئەم دڵدارە تێزار بوو، کاساتسکی خۆشی ئاشق و شەیدای بوو.

بۆ ڕۆژی دوایی مۆڵەتی وەرگرت و ئیستیعفای نووسی، وازی لە ئەرتەش هێنا و گوتی نەخۆشە، تاکوو بەو بیانووە هیچ کەس وەرنەگرێ و ڕۆیشت بۆ گوند.

هاوینی لە گوند ڕابوارد و گەشەی بە کاروبارەکانی خۆی دا.

کە پاییز بە سەردا هات نەگەڕایەوە بۆ پترزبۆرگ، بەڵکوو چوو بۆ کەنیسەیەک و لەوێ بوو بە ڕاهیب.



دایکی نامەی بۆ دەنووسی و هەوڵی دەدا پێملی بکات و لەو بڕیارە پاشگەزی بکاتەوە. بەڵام ئەو لە وەڵامی دایکیدا دەیگوت بانگی خودا لە هەموو شتێک گرینگترە و ئەو ئەم بانگهێشتنەی خودای لە دڵی خۆیدا هەست پێکردووە. تەنیا خوشکی، کە بۆ غوروور و هیممەت هاوسەنگی ئەو بوو، لە قسەی ئەو تێدەگەیشت. ئەو تێدەگەیشت کە براکەی بۆتە ڕاهیب تاکوو لەو کەسانە سەرتر بێ کە خۆیان لەو بە سەرتر دەزانن و باشیش تێگەیشتبوو. براکەی کاتێک پێی نایە کەنیسە، نیشانی دا ئەوەی کە بە لای خەڵکەوە گرینگ بووە و ئەو خۆشی بە گرینگی دەزانی، ئێستا بە سووک و بێبایەخی دەزانێ و خۆی بە پێگەیەک گەیاندووە کە لە سەر ئەوێوە بە چاوی سووکایەتی لە کەسانێک دەڕوانێ کە پێشتر ئێرەیی پێ بردبوون. بەڵام ئەوەی ڤارنکا[1]ی خوشکی تێیدەگەیشت تەنیا ئەوەندە نەبوو کە ئەوی بۆ ئەو ڕێگایە ڕێنوێنی دەکرد. ئەو هەستێکی تریشی لە دڵدا بوو کە ڤارنکا لێی بێخەبەر بوو ئەویش هەستێکی بەڕاستی ئایینی بوو، کە لەگەڵ هەستی غوروور و خولیای ناوبانگ ئاوێتە دەبوو. ئەو دڵ تەزین و بەخۆدا شکانەوەی لە لایەن مێرییەوە (دەزگیرانەکەی) کە ئەو بە فریشتەیەکی پاکی دەزانی، وەهای ڕووخاندبوو دەتگوت بە سەر دنیاوە نییە، بە جارێ هیوابڕاوی کردبوو، ئەو هیوابڕاوییەش ئەوی بەرەو خوداپەرستی گێڕابۆوە، یانی گەڕانەوە بۆ ئیمانی سەردەمی منداڵی کە ئەو قەت دڵی لێی خافڵ نەبووبوو.

١- ڤارنکا سووکەڵەناوی ڤارڤارایە بۆ خۆشەویستی.

## (٣)

کاساتسکی ڕۆژی شفاعەتی مریەم چووە پەرستگە. گەورەقەشەی پەرستگە کە خۆی سەردەمێک لە چینی خانەدان و ستاریتس[٧] و هەروەها نووسەرێکی بیرمەند بوو، یانی سەر بە زنجیرەی ئەو ڕاهیبانە بوو کە ئاخێزگەیان والاکی بوو و کتومت سەریان لە ڕێی ئەو ئەحکامی ڕێبەرییەدا دادەنا کە هەڵیانبژاردبوو. ئەم گەورەقەشەیە شاگردی پیری بەناوبانگ ئامبرۆسیا[٨] بوو کە خۆشی شاگردی ماکار، و ئەویش شاگردی لیۆنید[٩] و ئەویش شاگردی پاییسی فێلیچ کۆڤسکی[١٠] بوو. کاساتسکی بوو بە یەکێک لە مریدانی ئەو مورشیدە.

جگە لەوەی لە کلێسە ئاگاداری ئەوە بوو کە لە هەمووان زیاترە، چێژی لەو ڕەنج و ئازارەش وەردەگرت کە بۆ دەستڕاگەیشتن بە کەماڵی دەرەکی و پاکیی دەروون تامڵی دەکرد. هەر بەو جۆرەی کە لە سەربازخانە نەک هەر ئەفسەرێکی نموونە بوو، بەڵکوو زیاتر لەوەی کە لێی داوا دەکرا ئەرکی بەجێدەهێنا و پەرەی بە سنووری کەماڵ دەدا، لە مەقامی ڕەهبانیشدا هەوڵی دەدا کامڵ بێت و نەک بە کردەوە، بەڵکوو بە نیەتیش پاک و پارێزگار و خاکەڕا و گوێڕایەڵ و

---

7- Staryets
8- Ambrocia
9- Leonid
10- Velitchkovsky



مێهرەبان بێ. هەر ئەو ڕۆحسووکی و گوێڕایەڵییە ژیانی ڕووحانیی ئەوی ئاسانتر دەکرد. هێندێ کات لە کەنیسە، کە بە هۆی نزیک بوونی لە شارەوە خەڵکێکی زۆر ڕوویان تێدەکرد، هێندێ شت جاروبار دڵتەنگی دەکرد و پێی ناخۆش بوو و وای لێ دەکرد وەسوەسەی سەرەڕۆیی لە کەڵلەی بدا، بۆیە ئەرکی گوێڕایەڵی بۆ سووک کردنی باری دڵی زۆر باش و کاریگەر بوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «ئەرکی من بیر کردنەوە و ناسینی ڕێگای ڕاست نییە. من دەبێ ئەو ئەرکەی پێم سپێردراوە بە ڕێوەی بەرم، جا بە وریایی ڕاوەستان بێ لە هەمبەر یادگارە پیرۆزەکاندا یان خوێندنەوەی سروودی ئایینی لەگەڵ کۆمبێژان، یان تەنانەت ئەگەر بیخەنە ئەستۆی، کاروباری حیسابداریی کلێسە.» هەر ئەو گوێڕایەڵی و فەرمانبردنەی گەورەقەشەی کلێسە هەموو جۆرە دڕدۆنگییەکی لە دڵیدا لە نێو دەبرد. ئەگەر ئەو فەرمانبردنە کامڵ نەبوایە، یەکهاوی بوون و درێژەکێشانی نوێژ و شێواویی ئاشتیی ناوەوەی پەرستگە کە بە هۆی قەرەباڵغی و زۆر بوونی زیارەتکەرانەوە بوو، یان کەموکووڕیی خدە و هەڵسوکەوتی ڕاهیبەکان، هەموو ئەوانە دەبوونە هۆی ئازار و دڵناخۆشی لە ژیانیدا. بەڵام ئێستا ئەو ناخۆشییانەی نەک بە ئاسانی تامڵ دەکرد، بەڵکوو لەواندا ئۆخژن و توانایی و خۆڕاگریی دەدۆزییەوە. «نازانم بۆ دەبێ ڕۆژی چەند جار گوێ بۆ یەک جۆر دۆعا ڕاگرم؟ تەنیا ئەوە دەزانم کە دەبێ گوێ بگرم و چونکە دەزانم ئەو گوێ گرتنە پێویستە، بە گوێ گرتن کەیفم ساز

دەبێ و هەست بە شادی دەکەم.» گەورەقەشە دەیگوت هەر ئەو جورەی خواردن بۆ درێژە پێدانی ژیان پێویستە، درێژەدانی ژیانی ڕووحانیش بەبێ خۆراکی ڕووحانی مەحاڵە و ئەو خۆراکە ڕۆحانییەش دۆعا خوێندن بوو. کاساتسکی باوەڕی بە خۆڕاگریی ئەو وتە هەبوو و بە ڕاستی ئەگەرچی هێندێ جار زوو هەستانی بەیانیان و چوونە کلیسای بە لاوە دژوار بوو، بەڵام ئەو دۆعایەی لە کلیسا دەخوێندرا سەرچاوەی شادی و سەفای دەروونی بوو. ئاگادار بوون لە تەسلیمی یەکجاری و بڕوای تەواو بە دروستیی ئاکار کە هەمووی لە سایەی ڕێنوێنییەکانی پیرەوە بەڕێوە دەچوو، دەبووە هۆی نەشە و شاگەشکە بوونێکی ڕۆحی. هۆگریی ئەو بەم شێوە ژیانە تەنیا بە هۆی تەسلیم بوون و کەوی کردنی سەرەڕۆییەکانی نەفس و حاشا کردن لە ئیرادەی خۆی نەبوو، بەڵکوو بە هۆی هەوڵەکانییەوە بوو لە ڕێگای گەیشتن بە ڕازەکانی ئایینی مەسیح و لەبەرچاو گرتنی ئەرکە دینییەکان کە دەست ڕاگەیشتن پێیان لە سەرەتاوە ئاسان هاتبووە بەرچاوی. هەموو سامانەکەی خۆی دابوو بە خوشکی و بۆشی بە داخەوە نەبوو. لە تەوەزەلی بێزار بوو. خاکەڕایی لە هەمبەر کەسانی لە خۆی چکۆلەتردا نەک بە لایەوە ئاسان، بەڵکوو سەرچاوەی نەشە و دڵخۆشیش بوو. تەنانەت زاڵبوون بە سەر هەوا و هەوەس و تەماحدا بە لایەوە دژوار نەبوو. پیر ئەوی بە تایبەتی لەو تاوانە مەنع کردبوو. بەڵام کاساتسکی دڵخۆش بوو کە دەیتوانی خۆی لەو بەندە ئازاد بکات.



تەنیا شتێک کە ئازاری دەدا بیرەوەریی دەزگیرانەکەی بوو و ئەوەش نەک هەر بیرەوەریی ئەو بەڵکوو وێنەیەکی لەوەی کە لەوانە بوو بە سەری هاتبێ. بێئیختیار یەکێک لە گراوەکانی ئیمپراتۆری وەبیر دەهاتەوە کە دواتر شووی کردبوو و هاوسەرێکی شایان و دایکی بنەماڵەیەکی بەختەوەر بوو. مێردەکەی پلەوپایەیەکی بەرزی بەدەست هێنابوو، خاوەنی دەسەڵات و جێگای ڕێزی هەمووان بوو. ژیانێکی خۆش و شیرینیشی لەگەڵ ژنێکی پەژیوان و مێهرەبان پێک هێنابوو.

ئەو بیرانە لە کاتی هێمنایەتیدا سەفای دڵی کاساتسکی تێکنەدەدا، بە پێچەوانەوە ئەگەر لەو ساتانەدا ئەم بیرانە بە زەینیدا تێدەپەڕین، دڵی شاد دەبوو، چونکە دەیدی لە دوای ئەو نەگبەتی و ئاژاوەیە ڕزگاری بووە. بەڵام هێندێ کات هەبوو ئەوەی دەبووە هەوێنی ژیانی و مانای بە ژینی دەبەخشی لە ناکاو لە بەرچاوی ڕەش دەبوو. هەڵبەت هەروا بڕوای پێی هەبوو بەڵام ئیتر بە ڕوونی نەیدەدی. نەیدەتوانی ئەو دڵنیاییەی کە دەیویست لە ناخی خۆیدا بیدۆزێتەوە لەگەڵ بیرەوەرییەکانی پێکەوەیان گرێ بداتەوە، بە داخەوە پەشیمانییەک دڵی دادەگرت و نەیدەهێشت ئەو ڕێگایە بگرێتە بەر.

تەنیا گوێڕایەڵی و کار و دۆعا خوێندن، ئەگەر تەواوی ساتەکانی ڕۆژانەی پڕ بکردایەتەوە، لەو تەنگژەیە دەربازی دەکرد. ئەو بە شێوەی ئاسایی خۆی دۆعای دەخوێند و کڕنۆشی دەبرد. تەنانەت زیاتر لە کاتی ئاسایی. بەڵام دۆعاکانی تەنیا بە زمان بوو و ڕۆحی

لەودا بەشداریی نەدەکرد و ڕۆژێک و هێندێ جار دوو ڕۆژی دەخایاند و پاشان بەرە بەرە وەکوو تەم دەڕەوییەوە. بەڵام ئەو یەک دوو ڕۆژە زۆر سامناک بوو. کاساتسکی هەستی دەکرد ئیختیاری بە سەر خۆیدا نییە و لە نووری یەزدانی بێبەرییە، لە ژێر کارتێکەریی بێگانەیەکدایە و تەنیا کارێک کە لە دەستی دەهات ئەوە بوو کە پیر داوای لێدەکرد، ئەویش ئەوە بوو کە پشوودرێژ بێ و ددان بە جەرگی خۆیدا بگرێ و هیچ هەنگاوێک هەڵنەهێنێتەوە. لە سەریەک لەو جۆرە کاتانەدا بە ئیرادەی خۆی نەدەژیا، بەڵکوو دەیدی ئیرادەی پیر بە سەریدا زاڵە و لە نێو خوێن و دەماریدا لە گەڕیاندایە، ئەو گوێڕایەڵی و فەرمانبردنەش هێمنایەتییەکی تایبەتی پێ دەبەخشی.

کاساتسکی بەو شێوەیە لە یەکەم پەرستگا کە ڕووی تێکردبوو ماوەی حەوت ساڵ ڕێگەی پارێز و خوداپەرستیی گرتەبەر. لە کۆتایی ساڵی سێهەمدا سەری تاشی و بە پلەی قەشەیی گەیشت و ناوی سێرگیی بە سەردا برا. ئەو سەرتاشینە لە دنیای دەروونی سێرگیدا ڕووداوێکی گرینگ بوو. بەر لەوەش هەر جارێک کە لە ڕێوڕەسمی عیشای ڕەببانیدا بەشداریی دەکرد هەستی دەکرد بارێکی قورس لە سەر دڵی لاچووە و چێژێکی ئاسمانی ڕۆحی دادەگرت. ئێستا خۆی ڕێوڕەسمی عیشای ڕەببانی ڕێبەری دەکرد و لەو کاتەدا لەوانە بوو لە خۆشیاندا شاگەشکە بێ، دڵیشی لێوڕێژ دەبوو لە ئەشقێکی خودایی. بەڵام ئەو هەستە لەگەڵ تێپەڕینی زەمان سەفای خۆی لە دەست دەدا و کەمڕەنگ دەبوو، جارێک کە بە دڵێکی خەمبار و



حاڵەتێکی خەمۆکەوە ڕێوڕەسمی عیشای ڕەببانی بەڕێوە دەبرد هەستی کرد ئەو حاڵەتەش کاتی و زووتێپەڕە و بەڕاستی ئەو هەستە لە ناخیدا خۆی لە کزی دابوو، بەڵام وەک خووخدەی لێ هات.

لە سەریەک ساڵی حەوتەمی سلووکی لە پەرستگا باوەسێرگی هەستی بە خەم و وەڕەزی دەکرد. ئەوەی دەبوو فێر بێ فێری بووبوو و ئەوەی دەبوو دەستی پێی ڕابگا، دەستی پێی ڕاگەیشتبوو و ئیتر هیچ کارێک نەمابوو بیکات. هەستی جاڕزی و سارد بوونەوەی لە خۆیدا دەدی و بەرە بەرە خەریک بوو بەهێزتر دەبوو. ئەو کاتە هەواڵی مەرگی دایکی پێگەیشت و هەروەها هەواڵی شوو کردنی مێری، بەڵام ئەو گوێی بە هیچکام لەو دوو هەواڵە نەبزووت و پێی شلوێ نەبوو. هەموو ئەشق و هۆگریی دەروونیی لە سەر ژیانی ڕۆحی و واتایی چڕ بووبۆوە.

ساڵی چوارەمی سلووکی بوو دیتی ئۆسقۆف زۆر بە نەرم و دلۆڤانی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکا و پیری کڵێسەش داوای لێکرد و وەک ئەرکێک خستیە سەر شانی کە ئەگەر خۆی حەزی لێ بێ، ئەرکی گرینگتری پێ دەسپێرن و نابێ خۆشی لێ ببوێرێ. ئەو قسەیەی پیر لە دڵیدا هەستی ناوبانگخوازی بەئاگا هێنا و هەوای مەقامێکی ڕۆحانی لە سەری دا، ئەوەش هەستێک بوو کە بۆ ڕاهیب زۆر نەشیاو بوو. ئەویان ڕاگوێست بۆ پەرستگەیەکی نزیکی پایتەخت. ئەو دەیویست ئەو مەقامە ڕەت کاتەوە بەڵام پیرەکەی ئەو ئەرکەی

پێ سپاردبوو و نەدەکرا سەرپێچی لێ بکا و ناچار پێمل بوو، ماڵئاوایی لە پیر کرد و بەرەو پەرستگای تازە وەڕێکەوت.

گوێزرانەوە بۆ پەرستگەی نزیک پایتەخت ڕووداوێکی گرینگ بوو لە ژیانی باوەسێرگیدا. لە شوێنە تازەکەدا هەموو جۆرە وەسوەسەیەک هەبوو و وزەی سێرگی هەمووی بۆ خۆڕاگری لە هەمبەر ئەوانەدا سەرف دەبوو.

لە پەرستگەکەی پێشوو وەسوەسەی ژن زۆری ئازار دەدا. بەڵام ئێستا لێرە ئەم وەسوەسەیە بە وزەیەکی ترسناکەوە هێمنایەتیی ئەوی تێکدەدا و گەیشتە جێیەک کە تەنانەت شکڵێکی دیاریکراوی بە خۆوە گرت. ژنێک کە ژیانە پڕ تاوان و بە گوناهـ ڕمووده بووەکەی بووبووە بنێشتەخۆشکەی سەر زاری هەمووان خۆی لە باوەسێرگی نزیک کردەوە و جۆرێکی نازونووز دەکرد کە دەیویست دڵی بڕفێنێ و ئاخریش ڕۆژێک قسەی لەگەڵ کرد و داوای لێکرد کە بچێت بۆ سەردانی. باوەسێرگی داواکەی ئەو ژنەی ڕەت کردەوە بەڵام حەز و ویستە دەروونییەکانی بە جۆرێک هەژابوو کە ترس دڵی داگرتبوو. ترسەکەشی بە جێیەک گەیشت کە نەیتوانی ددان بە خۆیدا بگرێ و ماجەراکەی بۆ پیرەکەی نووسی. بەڵام بەوە بەسندەی نەکرد و بەو مەبەستەی بە سەر حەزە دەروونییەکانیدا زاڵ بێ، ڕاهیبێکی گەنج کە لە ژێر چاوەدێریی خۆیدا بوو بانگی کرد و بە سەر شەرم و فهێتی خۆیدا زاڵ بوو و لە لای ئەو ددانی بەو لاوازییەی خۆیدا نا و داوای لێکرد کە لە هەموو جێیەک وەدوای بکەوێ و جگە لە کاتی عیشای



ڕەببانی یان ئەو کاتانەی کە فەرمانی گەورەتر لە خۆی بەجێدێنێ، لە هیچ شوێنێک چاوی لێ خافڵ نەکات.

جگە لەوەش ئاخێزگەیەکی گەورەی وەسوەسە لەم پەرستگا تازەیە ئەوە بوو کە زۆر لە گەورەقەشەی ئەم پەرستگەیە بێزار بوو کە پیاوێک بوو لە چینی خانەدانەکان و زۆر شارەزای داب و نەریت و ڕێوڕەسمی ئەم کۆمەڵگایە و لە بواری ئایینیدا بە دوای ناوبانگەوە بوو.

بۆ زاڵ بوون بە سەر ئەو سەرەڕۆییانەدا خاکەڕایانە هەوڵی دەدا، بەڵام لە قووڵایی دڵیدا داوەریی بە سەریدا دەکرد و بە شتێکی سووکوچرووکی دەزانی و ئەم هەستە ئاخری ڕۆژێک سینگی قەڵشتەوە و کفارەی کرد. دوو ساڵ بوو هاتبوو بۆ ئەو پەرستگا تازەیە و ماجەراکە بەم شێوەیە بوو. شەوی جێژنی شفاعەتی مریەم لە کلێسای گەروەی پەرستگە کە ڕێوڕەسمێک بەڕێوەچوو. خەڵکێکی زۆر لە ڕێگای دوور و نزیکەوە هاتبوون. باوەسێرگی لە شوێنی هەمیشەیی خۆی ڕاوەستابوو و دۆعای دەخوێند، یانی خەریکی ململانێ بوو لەگەڵ خۆیدا، کە هەمیشە لە ڕێوڕەسمی عیشای ڕەببانی، بەتایبەت لە کلیسای گەورە کاتێک خۆی بەڕێوەبەری ڕێوڕەسمەکە نەبوو، ئەو خەیاڵانە دڵی دادەگرت. ئەو ململانێ و کێشە دەروونییە بەو هۆیە بوو کە دەیدی زۆربەی خانەدانەکان و بەتایبەت ژنەکانیان بۆ مەرایی کردن و یانیها دین بۆ کلێسە و هەر ئەوەش وای لێدەکرد ڕقی هەستێ و خۆی بخواتەوە. هەوڵی دەدا چاوپۆشی

لەوانە بکات و سەرنجی ئەو ڕووداوانە نەدات کە لە دەوروبەری خۆی دەیدی. دەیویست نەیبینێ کە چۆن سەرباز هەتا نێو کلێساکە لەگەڵیان دێن و خەڵک دەکێشننە دواوە و ڕێگا بۆ ئەربابەکانیان دەکەنەوە. دەیدی کە ژنان ڕاهیبەکان پیشانی یەکتر دەدەن و بەتایبەت ئەو و ڕاهیبێکی تر کە بۆ جوانچاکی بەناوبانگ بوون. دەیویست لە ناخەوە چاوی خۆی ببەستێ و جگە لە شۆقی مۆمەکان لە سەر مێزی کلێسە و وێنە پیرۆزەکان و قەشەکان کە خەریکی کاروباری عیشای ڕەببانی بوون و جگە لە دەنگی دۆعا و سروودێک کە کۆمبێژان دەیانخوێندەوە هیچی تر نەبینێ و نەبیستێ و هیچ هەستێکی لە دڵدا نەبێ و جگە لە فەرامۆش کردنی خۆی و ئاگادار بوون لە بەجێهێنانی فەرزێک کە هەمیشە کاتی گوێ شل کردن بۆ دۆعا و پاڕانەوە، کە ئەو کارەشی زۆر کردبوو ڕاوەستابوو و هەر کاتێک کە پێویست بوایە کڕنۆشی دەبرد و خاچی خۆی دەکێشا. بەردەوام لەگەڵ خۆیدا خەریکی کێشە و ململانێ بوو، هێندێ جار بە ساردوسڕییەوە دەبووە قازیی خەنیمەکانی و هێندێ جاریش بە نەرمی و بیرێکی دژکام و خۆپارێزانەوە بە سەر خۆیدا زاڵ دەبوو. ئەو کاتە باوە نیکۆدیم[11] بەرپرسی دیوی جلان، کە لە دڵی ئەودا سەرچاوەی وەسوەسەی تاوان بوو - چونکە لە لای گەورەقەشە ماستاوچێتی و مەرایی دەکرد و باوەسێرگی بێئیختیار دەبووە قازیی ئەو و لە دڵی خۆیدا ئەوی بە مستەحەقی لۆمە و سەرکۆنە دزانی -

11- Nikodim



لێی نزیک بۆوە و دوای ئەوەی کڕنۆشێکی بۆ کرد گوتی کە قەشەی گەورە داوای کردووە لە حەرەمی کلێسە بچێ بۆلای و چاوی پێی بکەوێ. باوەسێرگی عەباکەی ڕێکوپێک کرد و کڵاوی قەشەیی لە سەر نا و بە پارێزەوە لە نێو ئاپۆرەی خەڵک هاتە دەرێ و چوو بۆ شوێنی دیاریکراو.

دەنگێکی ژنانەی بیست کە دەیگوت:

“Lise, regardez a votre droite, c’est lui!”[12]

“ou ou? Il n’est pas tellement beau!”[13]

باوەسێرگی دەیزانی کە بابەتی ئەو گفتوگۆیە خۆیەتی. بیستی وەک هەمیشە لە کاتی وەسوەسەدا لە بەرخۆیەوە دەستی کرد بە دۆعا خوێندن «خودایە لە وەسوەسەی تاوان بمپارێزە!» سەری داخست و بە پەنای دوو تریبۆندا تێپەڕی کە شوێنی کۆمبێژان بوو و لە دەرگای لای باکووری کلیساکەوە چووە دەرێ. کە لە حەرەم هاتە دەرێ بە پێی عادەت خاچی خۆی کێشا و لە هەمبەر وێنەی پیرۆزدا وەها خۆی کۆم کردەوە دەتگوت دەچێتە ڕکووع. پاشان سەری بەرز کردەوە و بە لاچاوێک لە گەورەقەشەی ڕوانی، کە کەسێکی‌تر بە جلوبەرگی زۆر شیاو و ڕازاوەوە لە پەنای ڕاوەستابوو، بەڵام سەیری ئەوی نەکرد.

١- فەرەنسییە، یانی: لیز، بڕوانە لای ڕاستی خۆت، خۆیەتی!

٢- فەرەنسییە، یانی: لە کوێ؟ ئەم خۆ تا ئەو ڕادەیە جوان نییە.

پیری کلێسە بە جلوبەرگی ڕۆحانی تایبەتی خۆیەوە لە پەنا دیوارەکە ڕاوەستابوو و دەستە کورت و قەڵەوەکانی لە عەباکەی هێنابووە دەرێ و لە سەر زگە دەرپەڕیوەکەی دانابوو و قامکی بە پەراوێزی کەلبەدوون کراوی عەباکەیدا دەهێنا، لەگەڵ ئەوەی بزەیەک نیشتبووە سەر لێوی، لەگەڵ میوانەکەی دەدوا. میوانەکەی ئەفسەرێک بوو بە یۆنیفۆرمی ژنراڵییەوە و پیتی نیشانەدەری ئەفسەرانی دەربار بە سەر سنگییەوە بوو. بە یەرەق و ڤالیسکەکەیدا دیار بوو کە ئاجوودانی تایبەتە. باوەسێرگی چاوی لەگەڵ ئەو نیشانەی فیز و دەعیە و سەربەشایەتییانەی ئەرتەش ئاشنا بوو، بۆیە بە سەرنجی تیلەی چاوێک بۆی دەرکەوت و ناسییەوە. ئەو ژنراڵە فەرماندەری پێشووی هەنگەکەی ئەو بوو، دیار بوو پلەوپایەیەکی گرینگی بە دەست هێناوە. باوەسێرگی لەڕێوە تێگەیشت کە پیری کلێسە لەو مانایە ئاگادارە و شانازی بە دیداری کەسایەتییەکی ئاوا پایەبەرزەوە دەکات و هەر بەو هۆیەش ڕوخساری سوور و قەڵەوی ئاوا دەدرەوشایەوە و تەنانەت سەرە سافەکەی بریقەی دەهات. باوەسێرگی بە دیتنی ئەو دیمەنە دڵی داگیرا، بەتایبەت کاتێک کە بە قسەکانی پیردا بۆی دەرکەوت کە تەنیا لەبەر ئەو هۆیە ئەوی بۆ لای خۆی بانگ کردووە کە کونچکاویی ژنراڵ ڕازی بکات، چونکە ژنراڵ حەزی کردووە چاوی بە ئەفسەری پێشووی خۆی بکەوێ.



ژەنراڵ دەستی هێنایە پێشێ و گوتی: «زۆر بەختەوەرم کە ئێوە بەو فۆڕم و دیمەنە ئاسمانییەوە دەبینم. هیوادارم هاوقەتاری پێشووی خۆتت لە بیر نەبردبێتەوە.»

ڕوخساری سوور و قەڵەوی پیری پەرستگا کە لە نێوان ڕیشە سپییەکەیدا بزەی تێزابوو، وەک ئەوەی وتەکانی ژەنراڵ پشتڕاست بکاتەوە، ڕوخساری قەڵەو و تیفتیفەدراو و پڕ ترووسکەی ژەنراڵ لەگەڵ زەردەخەنەکەی، کە پیشاندەری ڕەزایەتی ئەو بوو، بۆنی شەڕابێک کە لە دەمی دەهات و بۆنی جگەرەی بەرگ کە لە ڕیشی چەکمەیی سەر ڕوومەتی دەهات، هەموو ئەوانە هۆش و ئیختیاری لە باوەسێرگی بڕی و بێئەوەی گوێ بە ژەنراڵ و دەستی بدات کە بۆ تەوقە هێنابوویە پێشێ، ڕووی لە پیری پەرستگا کرد و گوتی: «گەورەم، منتان بانگ کرد بێمە خزمەتتان؟» بێدەنگ ڕاوەستا و حاڵەتی دەموچاو و جووڵانەوەی بێئەوەی زمانی بگەڕێ دەیپرسی: «چ کارێکت پێم بوو؟»

پیری کلێسە گوتی: «بەڵێ، بۆیە بانگم کردی تاکوو چاوت بە ژەنراڵ بکەوێ!»

باوەسێرگی ڕەنگی هەڵبزرکا و لێوی کە لەبەر تووڕەیی دەلەرزی گوتی: «گەورەم، خۆت دەزانی من بۆیە تەرکەدنیا بووم تاکوو خۆم لە وەسوەسەکان ڕزگار بکەم. بۆ دیسان دەتهەوێ بمخەیتەوە نێو ئەم گێژاوی وەسوەسەیەوە، ئەویش لە کاتی ڕێوڕەسمی عیشای ڕەببانیدا و لەو شوێنە پیرۆزەی خودا؟»

پیری پەرستگە سوور هەڵگەڕا و بە نێوچاوانێکی گرژەوە تەشەری پێدادا: «باشە، بڕۆ... بڕۆ...!»

باوەسێرگی ڕۆژی دوایی داوای لێبوردنی لە پیری پەرستگە و بڕا ڕۆحانییەکانی کرد کە خۆی تەسلیمی وەسوەسەی غورووری کردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا دوای شەوێک کە هەتا بەیانی خەریکی دوعا و پاڕانەوە بوو هاتە سەر ئەوەی لەو پەرستگەیە بڕوا و نامەیەکی بۆ پیری مورشیدی خۆی نووسی و تکای لێ‌کرد کە یارمەتیی بدات تاکوو بگەڕێتەوە بۆ پەرستگەکەی پێشوو یانی بۆ لای خۆی. بۆی نووسی کە هەست بە کەمایەسیی خۆی دەکات و بۆی دەرکەوتووە کە بە تەنیایی و بەبێ یارمەتیی ئەو ناتوانێ لەگەڵ وەسوەسەی تاوان بەربەرەکانێ بکات و ددانی بە تاوانەکەیدا نا کە کەوتبووە داوی و هەروەها پەشیمانیی خۆی دەربڕی. پیری پەرستگەی پێشوو خێرا وەڵامی نامەکەی بۆ ناردەوە. پیر لە نامەکەی خۆیدا نووسیبووی کە هۆکاری هەموو کێشە و گرفتەکانی فیز و لووتبەرزییە. بۆی ڕوون کردبۆوە کە دەرهەڵبوون و هەڵچوونی ڕق و تووڕەییەکەی بەو هۆیەوە بووە، کە هەرچەند لە ڕێگای خاکەڕاییەوە چاوپۆشیی لە پلەوپایەی ڕۆحانی کردووە، بەڵام لەو کارەدا خودای لەبیر نەبووە، بەڵکوو ئامانجی تەنیا قایل کردنی فیز و دەماری خۆی بووە. لەبەر ئەوە بڵێ «من کەسێکم کە پێویستیم بەم شتانە نییە.» هەر بەو هۆیە نەیتوانیوە هەڵسوکەوتی پیری کلێسە تامڵ بکات. حەتمەن پێی‌وایە کەسێکە کە پشتی لە هەموو بایەخ و شانازییەکان کردووە و ئێستا



وەکوو ئاژەڵێک دەیخەنە بەرچاوی خەڵک. «ئەگەر تۆ لەبەر خاتری خودا پشتت لە شانازییەکان بکردایە، دەتتوانی ئەو سووکایەتییە زۆر بە ئاسانی تامڵ بکەی. پۆز و دەماری ئەشرافییانە هێشتا لە ناختدایە و گڕەکەی دانەمرکاوە. من بیر لە تۆ دەکەمەوە کوڕم! دوعام بۆ کردی و خودا ئەو بیرەی خستە مێشکمەوە کە پێت ڕابگەیەنم و بڵێم: "بە شێوەی ڕابردوو درێژە بە بەربەرەکانێ و خەباتەکەت بدە و لە مەندی و خاکەڕایی خافڵ مەبە." لەم دواییانەدا هەواڵ گەیشتووە کە پیری پاکداوێن ئیلاریۆن[14] کە لە پەرستگەی تامبینۆ[15] گۆشەنشین بوو و بە دژکامی ژیابوو. پیری پەرستگە لە منی پرسیوە کە برایەکم پێ شکنایە کە بێت لێرە ببێتە گۆشەنشین. هەر ڕاست لەو کاتەشدا نامەکەی تۆم بە دەست گەیشت. بچۆ بۆ تامبینۆ لەوێ چاوت بە باوە پاییسی[16] بکەوێ کە پیری ئەو پەرستگەیە. من نامەیەکی بۆ دەنووسم و تۆش داوای لێ بکە حوجرەی ئیلاریۆن بدا بە تۆ. پێت وانەبێ دەتوانی جێگای ئیلاریۆن بگریتەوە. بەڵام تۆ پێویستت بە تەنیایی و چاوەدێری هەیە تاکوو بتوانی بە سەر هەوا و دەمارەکەتدا زاڵ بی. خودا بتخاتە سەر ڕێگەی ڕاست!»

باوەسیرگی فەرمانی پیرەکەی خۆی بەجێ‌هێنا. نامەکەی ئەوی پیشان پیری پەرستگە دا و داوای لێ‌کرد کە ودمی بدا حوجرەکەی و

14- Illarion
15- Tambino
16- Paissi

ئەوی تێیدایە بیداتەوە بە پەرستگە و دوای ئەوە ڕۆیشت بۆ چلەخانەی تامبینۆ.

پیری پەرستگەی تامبینۆ کە بەڕێوەبەرێکی کارزان بوو لە بنەماڵەیەکی بازرگان و دەوڵەمەندا لە دایک بووبوو. پیری کلێسە باوەسێرگیی زۆر بە ئاسانی و بە ئارامی وەرگرت و ئەوی لە حوجرەکەی ئیلاریۆندا نیشتەجێ کرد. سەرەتا سوختەیەکیان پێ سپارد تاکوو خزمەتی پێ بکات. بەڵام دواتر لە سەر داوای باوەسێرگی ئەو کوڕەیان لە حوجرەکەی دوور خستەوە و ئەو بە تەنیا مایەوە. ئەو حوجرەیە لە ڕاستیدا زاخەیەک بوو لە کێو دایانبڕیبوو و تەرمی ئیلاریۆنیشیان هەر لەوێدا ناشتبوو. لای دواوەی حوجرەکە گۆڕی باوە ئیلاریۆن بوو، لای پێشەوەش کە ژوورێکی چکۆلە بوو بۆ خەوتن، دۆشەکێکی کا و مێزێکی چکۆلەی لێبوو، ڕەفحەیەکیش کە وێنەی پیرۆز و هێندێ کتێبی لە سەر داندرابوو. دیوی دەرەوەی دەرگاکە ڕەفحەیەکی پێوە بوو، کە ڕۆژی جارێک ڕاهیبێک لە پەرستگەوە دەهات و خواردنی بۆ دەهێنا و لە سەری دایدەنا.

لەو کاتەوە ئیتر باوەسێرگی بوو بە دژکام و گۆشەنشین.



## (٤)

لە ساڵی شەشەمی گۆشەنشین بوونی باوەسێرگیدا و لە شەوی کەرنەڤاڵدا، دەستەیەک ژن و پیاوی لە چینی دەوڵەمەندان و خۆشڕابوێرانی شارەکەی نزیکیان دوای خواردن و خواردنەوەیەکی زۆر هاتنە سەر ئەوەی کە سەیرانێک بە ترویکا بکەن. ئەو تاقمە بریتی بوون لە دوو پارێزەر و خاوەن مڵکێک و ئەفسەرێک و چوار ئافرەت. ژنەکان یەکیان هاوسەری یەکێک لە پارێزەرەکان بوو و یەکێکی تریشیان هاوسەری خاوەن مڵکەکە و سێهەمیش دشی ئەو بوو کە کچێکی عازەب بوو، چوارەمیش ژنێکی شۆخوشەنگ و دەوڵەمەند بوو کە تەلاقی لە مێردەکەی وەرگرتبوو و کاری نائاساییی دەکرد و خەڵکی شارەکەش بە هۆی ئەو ئاکارە سەیر و دەلووکارانەیەوە تووشی سەرسوڕمان بووبوون.

هەواکەی زۆر خۆش بوو و ڕێگاکەش تەکووز و لەبار. نزیکەی دە وێرست کە لە شارەکە دوور کەوتنەوە، ڕاوەستان و دەستیان کرد بە ڕاوێژ کردن کە چبکەن. بگەڕێنە بۆ شار یان درێژە بە ڕێگا بدەن.

ماکۆڤکینا[١٧]، ئەو ژنە جوان و شۆخەی کە تەڵاقی وەرگرتبوو، پرسیی: «ئەم ڕێگایە بۆ کوێ دەچێ؟»

پارێزەرێک کە دەیویست دڵی بێوەژنەکە بە دەست بهێنێ، گوتی: «ئەمە ڕێگای تامبینۆیە کە نزیکەی دوازدە ویرست لێرەوە دوورە.»

«ئەی دوای تامبینۆ دەگاتە کوێ؟»

«دوای ئەو دەچێتە پەرستگە و شارەکە.»

«یانی هەر ئەو شوێنەی کە باوەسێرگیی بەناوبانگ لەوێ گۆشەنشین بووە؟»

«بەڵێ، ڕاست ئەوێیە!»

«هەر ئەو کاساتسکییە، دژکامی جوانچاک؟»

«بەڵێ!»

«Messeiurs et Masdamset.»[١٨] با بچین بۆ لای کاساتسکی. لە تامبینۆ پشوو دەدەین و خواردن دەخۆین. با لێرە ماتڵ نەبین و وەڕێبکەوین.»

«ئاوا بێ ناتوانین بگەڕێینەوە بۆ ماڵێ.»

«قەیناکا! شەوێ میوانی کاساتسکی دەبین.»

«پەرستگە میوانخانەیەکی هەیە کە زۆر خۆشە. من کاتێک پارێزەری داکۆکیکاری ماخین بووم لەوێ ماومەتەوە.»

«نا، من شەوێ هەر لە حوجرەی کاساتسکی دەمێنمەوە.»

17- Makovkina

٢- فەرەنسییە، یانی خانمەکان و ئاغایان.



«ئەو کارە مەحاڵە. تەنانەت ئێوەش کە بۆ هیچ کارێک بەرگێڕەوەتان نییە، لێرە مەحاڵە بتوانی مەرز بپەڕێنی.»

«مەحاڵە؟ گرێو دەکەین.»

«باشە، ئەگەر تۆ شەوێ توانیت لە لای ئەو بمێنیتەوە هەرچییەکت بوێ دەتدەمێ.»

«A diseretion.»[١٩]

«لە لایەن ئێوەشەوە هەروا!»

«زۆر چاکە، با بڕۆین!»

ڤۆدکایان دا بە کاشەوانەکان و سندووقی پڕ لە پیراشکی و شەراب و شیرینی خۆیان هەڵیانگرت. ژنەکان باڵتەی گەرم و کەڵپۆسیان لەبەر کردبوو. کاشەوانەکانیش خەریکی مشتومڕ بوون کە کامیان لە پێشەوە بڕوا، لە کۆتاییدا یەکیان کە لە هەموویان گەنجتر بوو و زۆر پڕشۆر و لەخۆبایی بوو لە بەرێکەوە دانیشت و قامچییەکەی هەڵسووڕاند، گوڕاندی و زڕەی لە زەنگۆڵەکان هەستاند و سیرە و خشەی کاشەکان لەسەر بەفرەکە بەرز بۆوە، کاشەکان بە نەرمی و دەکرێ بڵێین بەبێ هیچ هەڵبەزدابەزێک بە سەر بەفرەکەدا دەخوشین. ئەسپەکەی نێوەڕاست کە کلکی لە ژێر قایشی کەفەڵیدا گرێ درابوو، بە نەرمی و چالاکی غاری دەدا. ڕێگای ڕێک و تەکووز و پرتاو بە ژێریاندا دەخوشی بۆ دواوە و کاشەوانەکان بە خۆ

١- فەرەنسییە، یانی بە دڵی خۆم.

نواندنەوە هەوسارەکانیان لە پشتی ئەسپەکان ڕادەکێشا. یەکێک لە پارێزەرەکان و ئەفسەرێک کە بەرەوڕووی ماکۆڤکینا دانیشتبوون قسەیان گەرم کردبوو و هیچ شتێک نەمابوو باسی نەکەن، بەڵام ماکۆڤکینا، باڵتە کەڵپۆسەکەی لە خۆی پێچابوو، بەبێ جووڵە دانیشتبوو و کەوتبووە گۆمی بیر و خەیاڵەوە. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «هەمووی هەر ئەوانەیە و سەرتاپای هیچوپووچی و سووکایەتییە! بەردەوام دەبێ چاوم لەو دەموچاوە سوور و بریقەدارانە بێ کە بۆگەنی ئارەق و جگەرەی بەرگیان لێ دێ. هەمووی هەر ئەو قسانە و ئەو ئاکارە گڵاوانە، ئەوەی باسیشی دەکەن هەر ئەو قسە قۆڕ و بێتامانەیە! چەندەش لەخۆڕازین و دڵنیان کە جگە لەوە نابێ ببێ و هەتا کاتی مەرگ درێژە بەو ڕێگایە دەدەن. بەڵام من ناتوانم. ئەم جۆرە ژیانە بۆ من تەنیا خەم و داخی پێوەیە. من شتێکم دەوێ کە ژیان ژێرەوژوور بکات. لانیکەم وەک ئەو ماجەرایەی کە بە سەر ساراتڤییەکان هات. ئەگەر بە هەڵە نەچووبێتم ساراتڤی بوون. بە سواری کاشە و ڕۆژێکی سارد و تۆفوبەند هێندە ڕۆیشتن هەتا هەموویان ڕەق هەڵاتن... ئێستا ئەگەر ئەم هاوڕێیانەی من بووایەن چییان دەکرد؟ حەتمەن زۆر خوێڕییانە هەرکام لە بیری دەرباز بوونی خۆیاندا دەبوون. هەرکەس لە بیری خۆیدا دەبوو. ڕەنگە منیش هەروەک ئەوان بووایەم. بەڵام من لانیکەم جوان و دڵڕفێنم. ئەمانەش ئەوە دەزانن. بەڵام ئەو ڕاهیبۆچکەیە! یانی بەڕاستی چاوی لە حاستی جوانیی ژنان کوێرە؟ نا، ئەمانە هەموویان وەک یەک وان، کە چاویان



بە ژنێکی جوان دەکەوێ ئەژنۆیان دەلەرزێ. ڕاست وەک خوێندکارەکەی زانکۆی ئەفسەری، پایزی ڕابردوو! بەڕاستی چەندەش گەوج بوو.»

گوتی: «ئیڤان ئیڤانۆڤیچ!»

«بەڵێ فەرموون!»

«چەند ساڵی تەمەنە؟»

«کێ چەند ساڵی تەمەنە؟»

«کاساتسکی ئیترا!»

«پێموا چل ساڵ و برێ.»

«هەرکەسێک بچێت بۆ لای وەریدەگرێ؟»

«بەڵێ. بەڵام نەک هەمیشە!»

«ئەو بەتانییە لە لاقم بهاڵێنە. نا ئاوا! وەی چەندە دەستەوستانی! نا، زیاتر! گەرمتر، ئاوا! پێویست ناکا ئەوەندە لاقم پێکەوە بگوشی.»

ئاخری گەیشتنە مێشەیەک کە حوجرەی ڕاهیبی لێ بوو.

ماکۆڤکینا لە کاشەکەی دابەزی و بە هاوڕێکانی گوت کە درێژە بە ڕێگای خۆیان بدەن. ئەوان هەوڵیان دا لە کەری شەیتانی دابەزێنن. بەڵام ماکۆڤکینا تووڕە بوو و فەرمانی پێدان کە درێژە بە ڕێگای خۆیان بدەن. ئەوان ڕۆیشتن و ئەو بە تەنیا بەو باڵتە سپییەوە کە لە پێستی گەماڵ بوو، توولەڕێیەکی گرتە بەر کە دەچووە ئەشکەوتەکەی ڕاهیب. پارێزەر لە کاشەکە دابەزی و چاوی تێبڕی.

## (٥)

باوەسێرگی شەش ساڵ بوو لەو زاخەیەدا گۆشەنشین بوو. تەمەنی چلونۆ ساڵ بوو. ژیانی پڕ بوو لە خەم و مەینەت، بەڵام نەک بە هۆی ڕۆژوو گرتن و دۆعا خوێندنەوە. ئەوانە بۆ ئەو زەحمەت نەبوون. ڕەنج و ئازاری سەرەکیی ئەو خەباتی دەروونی بوو، خەبات لەگەڵ خۆیدا. بە جۆرێک کە چاوەڕوان نەبوو ئەم کارە تا ئەو ڕادەیە دژوار بێ. سەرچاوەی ڕەنجەکەی ئەو لە دوو لاوە بوو، یەکیان شک و گومان و ئەوی دیکەیان هەوەس. ئەم دوو نەیارە هەمیشە پێکەوە هەڵیان‌دەکوتایە سەری. ئەو پێی وا بوو ئەم دوو نەیارە پێکەوە پێوەندییان نییە و ئەو دوو دوژمنە لە یەک دوورن. کەچی ئێستا یەکگرتوو بوون. هەرکاتێک بە سەر شکدا زاڵ دەبوو، بڵێسەی هەوەسیش دادەمرکا. بەڵام ئەو پێی وا بوو ئەو دوو بەڵایە لە لایەن دوو شەتیانی جیاوازەوەن و بە جیا جیا لە گەڵیان دەکەوتە خەبات و بەربەرەکانێ.

لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «خودایە، خودایە! بۆچی ئیمانێکی قایمم پێ نابەخشی؟ هەڵبەت بەڵای هەوەس ڕاستەقینەیە. تەنانەت قەدیمییەکانیش لە گەڵیدا بەرەبەکانێیان کردووە. حەدیسی ئانتۆنیۆی



قەدیس و دیتران... بەڵام ئەوان ئیمان و باوەڕیان قایم بوو، بەڵام بۆ من سات و کات و ڕۆژانێک هەیە کە دڵم سار دەبێتەوە و لە شیلەی گیانبەخشی ئیمان خاڵی دەبێ. بۆچی ئەم دنیایەت ئاوا جوان خوڵقاندووە و کەڵک وەرگرتن لەو دنیایەی خۆت بە تاوان داناوە و داوات لە بەندەکانی خۆت کردووە پارێزی لێ بکەن؟ بۆچی وەسوەسەت بۆ گیانی ئێمە خوڵقاندووە؟ وەسوەسە! خودایە یانی هەر ئەوە وەسوەسە نییە کە من دەمهەوێ خۆم لە شادی و چێژەکانی ژیان لادەم و تۆشەیەک بۆ ئەو دنیا بنێرم کە لەوانەیە هەر نەبێ و زیاتر لە شتێکی خەیاڵی دەچێ؟» کە ئەو بیرە بە مێشکیدا هات ترسێک دڵی داگرت و لە خۆی بێزار بوو. بە خۆی گوت: «بوونەوەری چەپەڵ! تۆ بەو ئیمانە لەرزۆکەوە دەتەوێ ببیە قەدیس؟» دوای ئەوەی جنێوی بە خۆی دا و لە خۆی تووڕە بوو، دەستی کرد بە دۆعا خوێندن، بەڵام هەرکە دەستی کرد بە پاڕانەوە، وێنەی گیانداری خۆی لە زەمانی ڕابردوودا هێنایە بەرچاو کە لە کڵێسەی پەرستگە ڕێوڕەسمی عیشای ڕەببانی بەڕێوە دەبرد و جلوبەرگ و کڵاوی جۆراوجۆری لە سەر دەکرد و بە قەڵافەتێکی شاهانەوە ڕادەوەستا، سەری ڕادەوەشاند و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «نا، ئەوە ڕاست نییە. ئەوانە هەمووی فێڵ و تەڵەکەیە. دەکرێ خەڵک فریو دەی، بەڵام خۆت و خودا ناتوانی هەڵخەڵەتێنی. من لە کوێ و ڕۆحانییەتی ئاسمانی لە کوێ! من پیاویلکەیەکی گەمژە و شیاوی بەزەییم و لەوە زیاتر هیچ نیم!» ئاتەگی عەباکەی خۆی لادا و لاقە کز

و ڕەقەڵەکانی خۆی لە ژێرپاتۆڵێکدا دی و تەوسەبزەیەک نیشتە سەر لێوی و سەری ڕاوەشاند.

پاشان ئاتەگی عەباکەی دادایەوە و دەستی کردەوە بە پاڕانەوە و دۆعا خوێندن و خاچ کێشان و سوجدە بردن. گوتی: «یانی دەبێ ئەم جێوبانە ببێتە گۆڕی من؟» وەک بڵێی شەیتان بوو سرتاندی بە گوێیدا: «بەڵێ، پێخەفێک کە ماڵی تەنیاییە گۆڕە و لەگەڵ گۆڕ هیچ جیاوازییەکی نییە. ئەوانە هەمووی فێڵ و درۆیە.!» شان و ملی ڕووتی بێوەژنێکی هێنایە بەرچاوی کە سەردەمێک پێوەندیی لەگەڵیدا هەبوو. خۆی قیت کردەوە و درێژەی بە دۆعاکەی دا و کە فەرزەکەی[٢٠] بەجێهێنا، ئینجیلی هەڵگرت. لێکیکردەوە و خوداوڕاستان ئەو لاپەڕەیە کرایەوە کە ئەو زۆر جار لەبەر دەیخوێندەوە: «خودایە من ئیمانم بە تۆ هەیە. یارمەتیم بدە با لەگەڵ ئیمانلاوازی بەربەرەکانێ بکەم.» کە ئەوەی گوت تەمی شک و دڕدۆنگییەکانی کە دڵی داگرتبوو ڕەوییەوە. هەروەک چۆن بە پارێزەوە شتێکی لەرزۆک و خۆنەگرتوو لە شوێنێک دادەنێن، ئەویش ئاوا ئیمانی خۆی لە سەر پایەیەکی لەرزۆک دانایەوە و بە پارێزەوە کشایەوە نەک بکەوێتە خوارێ. چاوبەندەکەی کێشایەوە سەر چاوی و هێمنایەتی باڵی بە سەر گیانیدا کێشا و دۆعایەک کە لە سەردەمی منداڵییەوە هەمیشە بەر لە خەو دەیخوێند، خوێندییەوە: «خودایە

١- مەبەست فەرزی پەرستگەیە کە هەموو ڕاهیبێک دەبێ ڕۆژی چەند بەشی لێ بخوێنێتەوە.



وەرمگرە، خودایە وەرمگرە!» بە خوێندنی ئەو دۆعایە نەک هەستی بە ئۆخژن کرد دڵیشی پڕ بوو لە شادی. خاچی خوی کێشا و لە سەر چرپا باریکەکەی خۆی ڕاکشا و جلە هاوینییەکانی گرمۆڵە کرد و نایە ژێر سەری. لەڕێوە خەوی لێکەوت و لە خەوە سووکەکەیدا پێی وا بوو زڕەی زەنگوڵەی کاشەیەک دەبیستێ. هەروەها گوێی لە لێدانی دەرگاکەش بوو. بەڵام نەیدەزانی خەون دەبینێ یان بەخەبەرە. هەستا و دانیشت، بەڵام بڕوای بە هۆش و هەستی خۆی نەدەکرد. دیسان تەقەی دەرگای حوجرەکەی دووپات بۆوە. بەڵێ، تەقەی دەرگابوو. کەسێک هاتووە بۆ حوجرەکەی و لەگەڵ تەقەی دەرگاکە دەنگی ژنێکیشی بیست.

«خودایە، یانی ئەوەی لە کتێبی ژیانی قەدیسەکاندا نووسراوە، ڕاستە؟ یانی بەڕاستی شەیتان بۆ بەلاڕێدا بردنی مرۆڤ و ڕموودە کردنی بە تاوان خۆی دەکاتە شێوەی ژن؟ بەڵێ، دەنگی ژنێکە و چ دەنگێکی ناسک و شەرمن و خۆشیشی هەیە! پەککوو!» تفێکی لە عەرزەکە کرد تاکوو شەیتان لە خۆی بتارێنێ. بە خۆی گوت: «نا، خەیاڵە!» چوو بۆ ئەو شوێنەی کە چوارپایەی دۆعا خوێندنەکەی لێبوو، بە شێوەی خۆی کە خووی پێگرتبوو و هەر ئەو کارەش دەبووە هۆی سووکنایی هاتن و هێور بوونەوەی و شادیی بە دڵی دەبەخشی، بە ئارامی چۆکی دادا. قژە درێژەکەی بە سەر نێوچاوانیدا شۆڕ بووبۆوە و تەوێڵی سافی بە قژی درێژی پشتەسەریەوە لە سەر

مافووره سارد و نمدار و چکۆلەکە دانا. کزەبا لە کەلێنی ژێر دەرگاکەوە دەهاتە ژوورێ.

دۆعایەک کە پیری تەرکەدنیا پی‌مەن[21] فێری کردبو و لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە بۆ دوور خستنەوەی تاپۆ و دەنگی خەیاڵی کاریگەرە، لە مەزامیردا خوێندبییەوە. ئەندامی لاواز و سووکی لە سەر لاقە کز و بەڵام بەهێزەکانی خۆی بەرز کردەوە و هەوڵی دا کە هەروا دۆعا بخوێنێ. بەڵام بە جێی دۆعا خوێندن بێ‌ئیختیار گوێی شل کرد. دەیویست باشتر گوێی لێ بێ. بەڵام هەموو شتێک ئارام بوو. میچەکە دڵۆپەی دەکرد و تنۆک تنۆک دەتکایە نێو لەگەنێکەوە. دەرەوە تەمومژ بوو و تەمێکی چڕ ڕووبەری زەویی داگرتبوو. ئارام بوو. زۆر ئارام. لە ناکاو خشەخشێکی لەبەر پەنجەرەکەوە بیست و هەر ئەو دەنگە شیرین و ناسکەی پێشوو کە تەنیا دەگونجا لە گەرووی ژنێکی جوانەوە بێتە دەرێ، هاتە گوێی کە گوتی:

«دەرگاکەم لێ بکەوە با بێمە ژوورێ. بیکە بە خاتری حەزرەتی مەسیح دەرگاکەم لێ بکەوە...»

دەتگوت تەواوی خوێنی لەشی ڕژایە نێو دڵی و لەوێدا پەنگی خواردەوە. زۆر بە زەحمەت توانیی هەناسە هەڵکێشێ و کەوتە دڵەکوتێ. «خودایە یارمەتیم بدە. دوژمنەکانت لە نێو بەرە...»

«خۆ من ئیبلیس نیم.» دیار بوو ئەو لێوانەی کە ئەو وشانەی لێ هاتە دەرێ، بزەیان لێ نیشتووە. «من ئیبلیس نیم. ژنێکی تاوانبارم کە

21- Pimen



ڕێگام لێ شێواوە. مەترسە، گومڕا نیم. بەڕاستی ڕێگام لێ شێواوە، لێقەوماوم.» پێکەنی. «خەریکە لە سەرمانا ڕەق هەڵدێم، پەنایەکم دەوێ.»

باوەسێرگی نێوچاوانی بە پەنجێرەکەوە نا تاکوو ببینێ. بەڵام چرایەکی چکۆلە کە لە ژێر وێنەی پیرۆزدا هەڵکرابوو ئەمدیوی شووشەکەی ڕووناک کردبۆوە و لە دەرەوە هیچ شتێک نەدەبیندرا. هەردوو دەستی بەملا و ئەولای دەموچاوییەوە گرت و لە نێوان هەردوو لەپی دەستییەوە ڕوانیی. تەمومژ بوو، دارێک و لە لای ڕاستیشەوە ڕوخساری ژنێک کەوتە بەرچاوی. بەڵێ، هەر لەوێ، لە چەند سانتی‌مەتریی چاوانی ڕوخساری شیرین و مێهرەبان و ترس لێ‌نیشتووی ژنێک بوو کە کڵاوێکی تیسکنی لە سەردا و باڵتەیەکی پێتسی تیسکدرێژی سپیی لە بەردا بوو و بۆ لای ئەو خۆی دانەواندبوو. چاویان بە یەکتر کەوت و لە ڕێوە یەکتریان ناسییەوە.

نەک ئەوەی پێکەوە ئاشنا بن. قەتیان یەکتر نەدیتبوو. بەڵام بەتایبەت باوە سیرگی بە ڕوانینی ژنەدا هەستی کرد کە دەیناسێ و لە زمانی ئەو تێدەگا. دوای ئەوە ئیتر نەدەکرا وا بیر بکاتەوە کە ئەم ژنە ئیبلیسە نەک ژنێکی جوان و خوێن‌شیرین و شەرمن.

گوتی: «تۆ کێی؟ لێرە چیت دەوێ؟»

ژنە بە لەبزێکی دڵڕفێنانە و نازێکی شیرینەوە گوتی: «تکایە دەرگاکەم لێ بکەوە، خەریکە لە سەرمانا ڕەق دەبم. خۆ پێم گوتی ڕێگام لێ شێواوە.»

«بەڵام ئێوە چۆن...»

«خۆ من پیاوخۆر نیم. تۆخودا دەرگاکەم لێ بکەوە و ڕێگام بدە با بێمە ژووری، پاشان هەرچیت پێخۆشە لێم بپرسە. ئێستا هێندەم سەرمایە خەریکە ڕەق هەڵدێم.»

ژنە بەڕاستی ترسابوو و ئەو قسەیەی بە دەنگێکی لەرزۆک و گریانا‌وییەوە دەربڕی.

باوەسێرگی لەبەر پەنجێرەکە چووە ئەولاوە و چاوێکی لە وێنەی مەسیح کرد بە تاجە چوکڵەدارەکەیەوە. خاچی خۆی کێشا و لەبەر وێنەی مەسیحدا کڕنۆشی برد و گوتی: «خودایە، یارمەتیم بدە.» پاشان چوو بۆ لای دەرگاکە و بەرەو هەیوانێکی چکۆڵەی سەرداپۆشراو کردیەوە و بە کوێرە کوێرە چۆڵەپێچی دەرگای دەرەوەی دۆزییەوە و دەستی کرد بە کردنەوەی، لە پشت دەرگاکەوە ترپەی پێ دەهات. ژنە لە پشت پەنجێرەکەوە هات بۆ بەردەرگاکە. لەپڕ ژنە قیژاندی: «وەی!» باوەسێرگی زانیی کە پێی کەوتۆتە نێو گۆلاوی بەردەرگاکەوە کە دڵۆپەی میچەکە بوو لەوێدا گۆلاوی بەستبوو.

دەستی لەرزی و نەیتوانی چۆڵەپێچی پشت دەرگاکە لابا، چونکە زۆر توند بووبوو.

«وەی، ئەوە چی دەکەی؟ دە بیکەوە مردم. ڕێگام بدە بێمە ژووری! سەرتاپام خووساوە. هەموو گیانم بەستوویەتی. ئێوە هەر لە



بیری ڕۆحی خۆتاندان کە بە دۆعا و پاڕانەوە بیکەنە بەهەشتی و لە بیری مندا نین کە خەریکە ڕەق هەڵدێم...»

باوەسێرگی دەرگاکەی بە توندی بۆ لای خۆی کێشا و چۆڵەپێچەکەی ترازاند. کە جۆڵەپێچەکە ترازا، بێئەوەی بیر لە کاری خۆی بکاتەوە بە توندی پاڵی پێوەنا بۆ دەرێ و دەرگاکە بە ژنەدا درا.

لە ناکاو بە شێوەی قەدیمی هەڵسوکەوتی خۆی لەگەڵ ژنان، گوتی: «ئاخ، ببوورە!»

ژنە بە بیستنی ئەم «ببوورە»یە زەردەیەکی گرت و بە خۆی گوت: «ئەوەندەش کە باسی دەکەن دڕ و خوێنتاڵ نییە.» گوتی: «قەیناکا. ئێوە دەبێ من ببوورن!» ئەوەی گوت و خۆی کرد بە ژووریدا. «هەڵبەت من قەت ئیجازە بە خۆم نادەم کە ببمە هۆی ئازارتان. بەڵام لەم بارودۆخەدا پێشبینی نەکراوە...»

باوەسێرگی گوتی: «تکایە فەرموو وەرە ژووری!» ئەوەی گوت و چوو لەولاوە ڕاوەستا.

بۆنێکی خۆش و توند کە ئەو ساڵانێکی زۆر بوو ئیتر نەیبیستبوو بە سەریدا هات. ژنە لە هەیوانە چکۆڵەکە تێپەڕی و چووە نێو حوجرەکەوە. ڕاهیب دەرگای دەرەوەی داخست، بەڵام پشتی نەخست و بە دوای ژنەدا چووە حوجرەکەوە و بێئیختیار و بەردەوام دۆعای دەخوێند. «خودایە، عیسا مەسیح، کوڕی خودای مەزن. خۆت ڕەحم بە منی تاوانبار بکە. خودایە تاوانبارم. ڕەحم بە منی بێچارە بکە!»

ئەو وشانەی تەنیا لە دڵیدا دووپات نەدەکردەوە، بەڵکوو لێویشی دەبزواند.

گوتی: «تکایە فەرموون، فەرموون.»

ژنە لە چەقی حوجرەکەدا ڕاوەستابوو و ئاو لە باڵتەکەی دەچۆڕا و دەڕژایە سەر تەرکی ژوورەکە و چاوی لە باوەسێرگی دەکرد. چاوانی بزەی تێگەڕابوو.

«ببوورە کە خەڵوەتەکەم لێ تێکدای. بەڵام خۆت بڕوانە تووشی چ بارودۆخێک بووم.» پاشان دەستی کرد بە درۆ کردن: «... ئێمە لە شار هاتینە دەرێ بۆ گەڕان بە سواری کاشە و من لەگەڵ هاوڕێکانم گرێوم کرد کە بە تەنیا و بە پێیان دەتوانم لە ڤۆرۆبیۆڤکا[22]وە بگەڕێمەوە بۆ شار، ڕێگام لێ شێوا و ئەگەر بە ڕێکەوت تووشی حوجرەکەی ئێوە نەبوایەم...»

درۆکانی کە گەیشتە ئێرە لەو کارەی خۆی شەرمەزار بوو و شوێنەواری پەشیمانی لە ڕوخساریدا وەها خۆی نواند کە ناچار بوو کۆتایی بە قسەکانی بێنێ. چاوەڕێ نەبوو ئەو بەو شێوەیە ببینێ. باوەسێرگی ئەو جۆرەی ژنە چاوەڕوانی بوو جوانچاک نەبوو. لە بەرچاوی سەرنجڕاکێش بوو. قژی درێژ و ڕیشی ماشوبرنجی و تۆزێ لوولی و هەروەها لووتی باریک و چاوانی کە کاتێک لە ئەوی دەڕوانی وەک ئاور دەبریسکایەوە، شوێنێکی قووڵی لە سەر دڵی دانا.

باوەسێرگی بۆی دەرکەوت کە ژنە درۆ دەکا.

22- Vorobyovka



چاوێکی‌تری لێ کرد، پاشان سەری داخست و گوتی: «بەڵێ... هەروایە... من دەچمە ئەو پشتە و حوجرەکە بۆ ئێوە بەجێ‌دەهێڵم.»

چرا چکۆلەکەی لە دیوارەکە کردەوە و مۆمێکی هەڵکرد. کڕنۆشێکی بۆ ژنە برد و چووە کولێنی تەنگ و باریکی پشت دیوارەکە و ژنە گوێی لە دەنگی بوو کە شتێکی لە زەوی دەپڕژاند. بە پێکەنینەوە بە خۆی گوت: «حەتمەن خەریکە سەنگەر دەگرێ. لێم دەترسێ.» باڵتە پێستەکەی داکەند و کڵاوەکەی بە لەچکەیەکی دەستچنەوە کە قژی پێ داپۆشیبوو لە سەری کردەوە. بە پێچەوانەی ئەوەی گوتبووی ئەو کاتەی لە بەر پەنجێرەکە بوو، گیانی نەخووسابوو. درۆی کردبوو تاکوو کارێک بکات باوەسێرگی دەرگاکەی لێ بکاتەوە. بەڵام ئەوەی درۆ نەبوو کە کەوتبووە نێو ئاوەکەوە و لاقی چەپەی هەتا قولاپەی لە ئاوەکەدا خووسابوو. کەوشەکەی پڕ بوو لە ئاو. لە سەر تەختە باریکەکە دانیشت کە تەختەیەک بوو مافوورەیەکی باریکی لە سەر ڕاخرابوو و دەستی کرد بە داکەندنی کەوشەکانی. حوجرەکە زۆر جوان و نوقڵی هاتە بەرچاوی. ژوورێکی تەسک بوو لە باری پانی سێ ئارشین و باری درێژییەکەی چوار. زۆر پاک و خاوێن بوو. ژوورکە هیچی تێدا نەبوو جگە لەو چرپا باریکەی ئەو لەسەری دانیشتبوو، ڕەفحەیەکیش بە دیوارکەوە بوو و چوارپایەیەکیش لە سووچی ژوورەکە و شوێنی تایبەتی چۆکدادان و دۆعا خوێندن داندرابوو. کەڵپۆسێک و کراسێک بە بزماری پشت دەرگاکەوە هەڵواسرابوون. لە سەروو چوارپایەکەوە

چرایەک بە دیوارەکەوە بوو و وێنەی مەسیحی بە تاجە چوکڵەدارەکەیەوە ڕووناک دەکردەوە. حوجرەکە بۆنێکی سەیری لێ دەهات. بۆنی ڕۆنی زەیتوون و ئارەقەی لەش و خۆڵ، ژنە هەموو شتێکی حوجرەکەی کەوتە بەردڵ، تەنانەت بۆنەکەشی. لاقی تەڕ بووبوو، بەتایبەت یەکیان کە زۆر خووسابوو. ئازاری دەدا و خێرا دەستی کرد بە داکەندنی کەوش و گۆرەوییەکانی. لەو ماوەیەدا بەردەوام بزەی لە سەر لێو بوو، دڵخۆشییەکەشی نەک بەو هۆیەی کە بە ئامانجی گەیشتبوو، بەڵکوو زیاتر بەو هۆیەوە بوو کە توانیبووی کارێک بکات کە ئەو پیاوە سەیر و سەرنجڕاکێش و بەناوبانگ و جوانچاکە تووشی شەرمەزاری بکات. بە خۆی گوت: «وەڵامی منی نەدایەوە، بەڵام گرینگ نییە!»

«باوەسێرگی، باوەسێرگی! نازانم دەبێ ئێوە هەر ئاوا بانگ بکەم؟»

دەنگێکی ئارام گوتی: «چیت دەوێ؟»

«ببوورن کە خەڵوەتەکەم لێ تێکدان. بەڵام چبکەم. ناچار بووم. گیانم لە مەترسیدا بوو. خەریک بوو لە سەرمانا ڕەق هەڵدەهاتم و لەوانەیە نەخۆش کەوتبێتم. سەرتاپام خووساوە و لاقم خەریکە هەڵدەوەرێ!»

دەنگە ئارامەکە وەڵامی دایەوە: «ببوورن، بەڵام من ناتوانم هیچ یارمەتییەکتان بدەم.»

«ئەگەر ئاوام بزانیبایە دڵنیا بە نەدەبوومە هۆی ئازارتان. بەیانی زوو دەڕۆم!»



باوەسێرگی وەڵامی نەدایەوە و ژنە گوێی لە دەنگی بوو کە ویرەویر لە بەرخۆیەوە قسەی دەکرد. وێدەچوو دۆعا بخوێنێ.

ژنە پرسیی: «تکات لێدەکەم مەیە بۆ ئەم دیو. چونکە من دەبێ جلەکانم داکەنم و وشکیان بکەمەوە.»

باوەسێرگی بێئەوەی وەڵامی بداتەوە هەروا خەریکی دۆعا خوێندن بوو.

ژنە کە هەوڵی دەدا کەوش و گۆرەوییە خووساوەکانی داکەنێ، لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڵێ، پیاو ئەوەیە!» هەرچی کەوشەکەی دەکێشا، نەیدەتوانی داییکەنێ و وەک چەقە بە لاقییەوە نووسابوو، ئەوەش زۆر سەیر و پێکەنینی هاتە بەرچاوی و کەوتە پێکەنین. سەرەتا دەیویست بێدەنگ پێبکەنێ. بەڵام پێی وا بوو دەنگی پێکەنینەکەی شوێنی لە سەر دادەنێ ـ ئەوەش ڕاست ئەو شتە بوو کە ئەو دەیویست ـ و هەوڵی دا کەمتر بە بێدەنگی پێبکەنێ. پێکەنینەکەشی پڕ لە نەشە و سروشتی و شیرین بوو، هەر بە ڕاستیش شوێنی لە سەر باوەسێرگی دانا.

ژنە لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڵێ من پیاوی ئاوام خۆشدەوێ، بەو چاوە گەشانەوە دەڵێی پشکۆی ئاگرە، ئەو دەموچاوە نەجیم و ساکارە، کە توانایی ئەوینێکی پڕ لە خولیای هەیە! ئەگەرچی بەردەوام خەریکی دۆعا و نزایە و وشکە مەسەبییەکی توندە، بەڵام خۆشمدەوێ. ئافرەت قەت لەو جۆرە شتانەدا بە هەڵە ناچێ. لەو کاتەوە کە دەموچاوی بە شووشەکەوە نووساند و چاوی بە من کەوت، تێگەیشت و زانیی. ترووسکەی ئەشق لە چاوانیدا درەوشایەوە و ئەو ترووسکەیە هەروا

مایەوە. حەز و مەیل لە دڵیدا هەڵەسوونی هێنایەوە. دڵی بۆ من کەوتە لێدان و کەڵکەڵەی هەوەس لە ناخیدا سەری هەڵدا!» ئەوەی گوت و ئاخری توانیی کەوشەکەی داکەنێ و پاشان دەستی کرد بە داکەندنی گۆرەوییەکانی. بۆ داکەندنی ئەو گۆرەوییە ملدرێژانەی ناچار بوو داوێنی کراسەکەی هەڵداتەوە و دایانکێشێ. دیسان بە لەبزێکی شەرمنانەوە گوتی: «نەیەی بۆ ئێرە ها!»

بەڵام لەودیوی دیوارەکەوە هیچ دەنگێک نەهات.

ورتەورت و دۆعا خوێندنی باوەسێرگی هەروا بەردەوام بوو و جگە لەویش ترپە و خشەی جووڵانەوەی دەهات. ژنە بە خۆی گوت: «حەتمەن خەریکە سوجدە دەبا. بەڵام ئەو سوجدە بردن و دۆعا و پاڕانەوەیە هیچ کەڵکێکی نییە. خەیاڵی هەر لە لای منە. هەروەک من کە بیرم لە لای ئەوە.» گۆرەوییە تەڕەکانی لە لاقی داماڵی و درێژەی بە قسەکانی دا: «... ڕاست ئەو هەستەی منی لە دڵدایە و خەیاڵی هەر لە لای پووز و بەلەکی منە!» لە سەر چرپاکەی باوەسێرگی دانیشت و لاقی لە ژێر خۆیدا کۆ کردەوە. ماوەیەکی زۆر ئاوا دانیشت و پاشان چۆکی هەڵدا، ئەژنۆی لە باوەش گرت و مات و بێدەنگ چاوی لە شوێنێک بڕی. «بەڵێ، بەو بێدەنگییە، لەم سەحرا چۆڵوهۆڵە، هیچ کەس ئاگادار نابێ...»

لە جێی خۆی هەستا و گۆرەوییەکانی برد بۆ بەر کوورەکە و بە لای زارکی کوورەکەدا هەڵیواسین کە تینی گەرمای لێ دەهاتە دەرێ. ئەو زارکی گەرمازێیە بە شێوەیەکی تایبەت دروست کرابوو. سووڕاندی و پاشان بە لاقی ڕووتی گەڕاوە بۆ لای چرپاکە، دیسان وەک پێشوو لاقی



لە ژێر خۆیدا کۆ کردەوە و چوارمەشقی دانیشت. هیچ دەنگێک لە پشت تیغەکەوە نەدەهات. چاوێکی لە کاتژمێرە چکۆلەکەی کرد کە بە ملیدا هەڵواسرابوو. سەعات دووی دوای نیوەشەو بوو. «هاوڕێکانم دەبێ نزیک سەعات سێ بگەڕێنەوە. تەنیا سەعاتێکم دەرفەت هەیە. یانی چی! یانی دەبێ لێرە بە تەنیا دانیشم؟ قەت شتی وا نابێ! من کەسێک نیم بتوانم بە تەنیا هەڵبکەم. ئێستا بانگی دەکەم.»

«باوەسێرگی! باوەسێرگی! سێرگی دیمیتریچ! پرەنس کاساتسکی!»

هیچ دەنگێک لە پشت تیغەکەوە نابیسترێ.

بە دەنگێک کە پیشاندەری ئازارێکی زۆر بوو گوتی: «گوێ بگرە، ئەو کارەی تۆ ئەوپەڕی بێڕەحمییە. من ئەگەر ناچار نەبوایەم بانگم نەدەکردی. من نەخۆشم. نازانم بۆ ئاوا حاڵم تێکچووە.» لە سەر تەختەکە خۆی لە گەزدا و دەستی کرد بە ناڵە و نووکە نووک: «ئاخ!... وەی!...»

سەیریش ئەوە بوو لەڕێوە هەستی بە لاوازی و بێهێزی کرد. هەستی کرد هەموو گیانی ژان دەکات و سەرتاپای دەلەرزێ، لەپڕ تاویاوێکی قورس جەستەی گەرم داهێنا.

«گوێ بگرە، یارمەتیم بدە! من نازانم بۆ ئاوام لێ هاتووە! ئاخ... وەی!»

قۆپچەی کراسەکەی کردەوە. بەرۆکی ئاوەڵا کرد و سینگ و مەمکی ڕووت کرد، قۆڵی هەتا سەرووی هەنیشکی هەڵکرد و قۆڵە سپی و ناسکەکەی وەدیار خست. کاتێک پێسیری ئاوەڵا کرد و مەمکی وەدیار

کەوتن، مەمک نەبوون بەڵکوو دوو مانگ بوون لە ژێر هەوری کراس هاتنە دەرێ. خۆی لە سەر تەختەکە شل کرد و دیسان دەستی کردەوە بە ناڵە و نووکە نووک: «ئاخ، ئاخ، وەی، وەی... خودای گەورە بگە فریام، ئاخ سووتام!»

لە تەواوی ئەو ماوەیەدا باوەسێرگی لە نێو خەڵوەتییەکەی خۆیدا ڕاوەستابوو و دۆعای دەخوێند، کاتێک دۆعاکانی شەوی تەواو بوو، چاوی لە نووکی لووتی خۆی کرد و هەروا بە پێوە و لە ناخی دڵەوە دۆعای خوێند و پاڕایەوە: «یا عیسا مەسیح، کوڕی پاکی خودا! ڕوحم بە ڕۆحی من بکە، بە تەنیا جێم مەهێڵە!» بەڵام هەر لەو کاتەدا ناڵە و هاواری ئەودیوی دیوارەکەی دەبیست و خشەخشی کراسی هەورێشم کە ژنە دایدەکەند. ترپەی پێی پەتیی ژنە کاتێک بە نێو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو ئەوی تووشی دڵەکوتێ کردبوو. ئاگای لێ بوو کە دەست بە ڕان و بەلەکە نەرم و شلەکانی خۆیدا دێنێ. هەستی دەکرد کە زۆر بێهێز و توانایە و سات لەگەڵ سات خەریکە دەڕووخێ و هەر بەو هۆیەش بەردەوام دەپاڕایەوە. هەستی ڕاست وەک هەستی ئەو کەسایەتیی چیرۆکە دەچوو کە کاتێک دەیویست ڕێگا ببڕێ و چاو لە هیچ شوێنێک نەکات، کەچی لە هەموو لایەکەوە دەنگی فریودەر و وەسوەسە بزوێن بانگیان دەکرد. باوەسێرگیش دەنگێکی دەبیست و هەستی دەکرد مەترسییەک لەو دیوی تیغەکەوە بۆسەی بۆ ناوەتەوە و پشت دیوارەکە گێژاوی تێداچوونە، ژوورسەری و دەوروبەری بە تەڵە و داوی پڕ مەترسی تەندراوە و ڕزگار بوونی ئەو تەنیا لەوەدایە کە



تەنانەت بۆ چرکەیەکیش چاو لە هیچ کوێیەک نەکات و بۆ ئەو مەترسییە نەگەڕێ. بەڵام لە ناکاو حەزی چاو لێکردن دڵی دادەگرێ و بە سەریدا زاڵ دەبێ.

«گوێ بگرە، ئەو کەمتەرخەمی و سەرساردییەی ئێوە لە مرۆڤایەتی بەدوورە.»

باوەسێرگی لە دڵی خۆیدا گوتی: «باشە، دەچم بۆ یارمەتیی. بەڵام هەر ئەو کارەی کە ئەو پیرە دژکام و لە خودا ترسە کردی و دەستێکی لە سەر سینگی ژنە خراپکارەکە دانا و دەستەکەی تری لە سەر سکڵی مەنقەڵی. بەڵام خۆ من لێرە مەنقەڵیی پڕ لە پشکۆم نییە.» چاوێکی بە دەوروبەری خۆیدا گێڕا. چراکە لەوێ بوو. قامکێکی لە سەر بڵێسەی چراکە ڕاگرت و نێوچاوانی گرژ بوو. چونکە خۆی ئامادە دەکرد کە ژانی سووتانەکەی قامکی تامڵ بکات و تا ماوەیەک ژانی هەست پێ نەکرد. بەڵام لە پڕ، تەنانەت بەر لەوەی ژانێک هەست پێبکا، دەستی کێشا دواوە و لەگەڵ ئەوەی ڕایوەشاند بە خۆی گوت:

«نا، من ئەو کارەم لە دەست نایە.»

«تۆ خودا، خۆ تۆ مرۆڤی و دڵت هەیە، ئاخ.. خودایە! ئاخ خودایە گیان چبکەم! ئاخر بۆ دەتەوێ من بمرم؟... نا، نابێ!»

باوەسێرگی گوتی: «ئێستا دێم.» دەرگاکەی کردەوە، بەڵام بێئەوەی چاو لە ژنە بکا، بە تەنیشتیدا تێپەڕی و لە دەرگای حوجرەکە چووە دەرێ و لە دالانەکە، ئەو شوێنەی ئێزنگی لێ دەشکاند، بە کوێرە کوێرە

کۆلکەدارێکی کە ئێزنگی لە سەر دەشکاند دۆزییەوە و پاشان تەورەکەشی لە پەنا دیوارەکە هەڵگرت.

گوتی: «هەر ئێستا!» قامکی شادەی دەستە چەپی لە سەر کۆلکەدارەکە دانا، تەورەکەی هەڵێنا و لە گرینچۆ بەرەوخوارێ قرتاندی. قامکە قرتاوەکەی سووکتر لە دارێکی وەک خۆی هەڵبەزییەوە و کەوتەوە سەر کۆڵکەدارەکە و دوای چەند جار هەڵبەز دابەز کەوتە سەر عەرزەکە.

ئەو بەر لەوەی هەست بە ژان بکات، زرمەی تەورەکەی بیست. بەڵام بەر لەوەی دەرفەتی سەرسوورمانی هەبێ، ژانێکی زۆر و کزانەوەی هەست پێکرد و هەروەها گەرمایی داچۆڕانی خوێنەکەی. لەڕێوە نووکی قامکە قرتاوەکەی لە ئاتەگی عەباکەی پێچا و توند بە ڕانی خۆیەوە گوشی و گەڕایەوە بۆ نێو حوجرەکە، بەرەوڕووی ژنە ڕاوەستا، سەری داخست و پرسیی: «چییە؟ چیتانە؟»

ژنە سەری هەڵێنا و کە چاوی بە ڕەنگە هەڵبزرکاوەکەی باوەسێرگی کەوت سپی هەڵگەڕابوو و دەستی چەپەی بە ئاتەگی عەباکەیەوە دەلەرزی، سەری سووڕما و لە ناکاو هەستی بە شەرمەزاری کرد. خێرا لە سەر تەختەکە هەستا و باڵتەکەی هەڵگرت و خۆی داپۆشی.

«بەڵێ، حاڵم زۆر خراپە... سەرمام بووە... من... باوەسێرگی.... من...»

باوەسێرگی کە دەموچاوی بە نوورێکی ئارام و ئاوێتەی شادی ڕووناک بووبۆوە، چاوی لە چاوی ژنە بڕی و گوتی: «خوشکی بەڕێز، بۆ دەتەوێ ڕۆحی هەرمانی خۆت بە تاوان ڕمووده بکەی؟ وەسوەسە



دەبێ بێتە سەر دنیا، بەڵام قوڕ بە سەر ئەو کەسەی کە وەسوەسە بە هۆی ئەوەوە بێتە سەر زەوی. لە خودا بپاڕێوە و دۆعا بکە لە تاوانت خۆش بێ.»

ژنە گوێی بۆ قسەکانی باوەسێرگی شل کردبوو. لە ناکاو ترپەی تراوێکی بیست کە دەتکایە سەر عەرزی. کە چاوی لێکرد دیتی لە ئاتەگی عەباکەی باوەسێرگییەوە خوێن دەچۆڕێ و دەتکێتە سەر تەرکی حوجرەکە.

«چیت لە دەستت کردووە؟» زرمەکەی تاوێک لەمەوبەری وەبیر هاتەوە و دەستی کێشا و بە پەلە چراکەی هەڵگرت و چووە دەرێ. دیتی قامکە بڕاوەکەی باوەسێرگی لە پەنا کۆلکەدارەکە کەوتووە. بە ڕەنگێکی بزرکاوتر لە باوەسێرگی گەڕایەوە بۆ نێو حوجرەکە و دەیویست شتێکی پێ بڵێ. بەڵام باوەسێرگی بە شێنەیی ڕۆیشتەوە بۆ خەڵوەتییەکە و دەرگاکەی لە سەر خۆی داخست.

ژنە گوتی: «بمبوورە! من چۆن دەتوانم ئەو تاوانەم قەرەبوو بکەمەوە؟»

«بڕۆ!»

«لێم گەڕێ با زامەکەی قامکت بۆ ببەستم.»

«لێرە بڕۆ!»

ژنە بێئەوەی هیچ بڵێ بە پەلە جلەکانی لەبەر کردەوە و باڵتەکەشی کردە بەری و چاوەڕوان دانیشت. زرمەی زەنگوڵەی کاشەکان لە دەرەوە دەبیسترا.

«باوەسێرگی، من ڕێگای ژیانم دەگۆڕم. تکایە یارمەتیم بدە و ئاگات لێم بێ.»

«بڕۆ!»

«تکایە بمبوورە و متفەڕکم بدەیە!»

دەنگی باوەسێرگی لە پشت تیغەکەوە هات کە گوتی: «بیکە بە خاتری باوک و کوڕ و ڕۆحی پیرۆز، بڕۆ!»

ژنە بە گریانەوە لە حوجرەکە هاتە دەرێ. پارێزەر هات بەرەو پیری.

«باشە، دیارە من گرێوەکەم دۆڕاندووە. لە کوێ دادەنیشی؟»

«جیاوازیی نییە، لە هەر کوێیەک بێ!»

ژنە لە سووچێکی کاشەکە دانیشت و هەتا ماڵێ زمانی نەگەڕا.

ساڵێک دواتر سەری خۆی تاشی و بوو بە خوشکێکی تەرکەدنیا و ژیانی پڕ لە مەینەتی پەرستگەی گرتەبەر و بوو بە ڕاهیبەیەکی تۆبەکار. ئەو لە سەر دەستی باوە ئارسنی[23] تۆبەی کرد، کە هێندێ جار نامەی بۆ دەنووسی و لە بواری دین و بیر و باوەڕدا ڕێنوێنیی دەکرد.

23- Arseny



## (٦)

باوەسێرگی حەوت ساڵی دیکە لە حوجرەکەی خۆیدا گۆشەنشین مایەوە. سەرەتا زۆربەی ئەو خێر و سەدەقانەی بۆیان دەهێنا، وەک چایی و قەند و نانی سپی و شیر و جلوبەرگ و ئێزنگ، وەریدەگرت. بەڵام بەرە بەرە و لەگەڵ تێپەڕینی زەمان خۆی لەگەڵ ژیانێکی دژوارتر ڕاهێنا و چاوپۆشیی لە کەلوپەل و خۆراکی باش و خوشبژیوی کرد. هەتا ئەو جێیەی کە جگە لە هێندێ نانی ڕەش، ئەویش جارێک لە حەوتوودا، هیچی دیکەی وەرنەدەگرت. ئەوەی کە زیارەتکەران پێیان دەدا و بە زۆر بۆیان بەجێدەهێشت هەمووی دەدا بەو هەژار و دەستکورتانەی کە هانایان بۆ دەبرد.

باوەسێرگی تەواوی کاتی خۆی لە حوجرەدا ڕادەبوارد و لەو ماوەیەشدا یان خەریکی دۆعا و پاڕانەوە بوو یان لەگەڵ ئەو کەسانە دەکەوتە دەمەتەقێ و ئاخافتن کە دەهاتن بۆ سەردانی، ئەو زیارەتکەرانەش کە دەهاتن بۆ لای، ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتر دەبوون. ساڵی دوو سێ جار بۆ چوونە کلێسە لە حوجرەکەی دەهاتە دەرێ، یان جاروبار بۆ هێنانی ئاو یان کۆ کردنەوەی ئێزنگ و سووتەمەنی، کاتێک لە زۆر پێویست دەبوو.

ماجـەراکـەی ماکۆڤکینـا پێـنج سـاڵ دوای گۆشـەنـشین بـوونی باوەسێرگی ڕووی دابوو و زۆر زوو هەواڵەکە بە وڵاتدا بڵاو بۆوە و هەموویان لەو سەردانە شەوانەیەی ژنە و ئاڵوگۆڕ بە سەردا هاتنی ژیانی و تۆبە کردن و تەرکەدنیا بوونی ئاگادار بووبوون. دوای ئەوە ناوبانگی باوەسێرگی زیاتر پەرەی سەند و لە دڵی خەڵکدا جێی کردەوە. تاقمی ئەو کەسانەی کە لە ڕێگای دوور و نزیکەوە دهاتن بۆ سەردانی بەردەوام لە زیاد بوون بوو. چەن ڕاهیبی تریش لە نزیک حوجرەکەی ئەو نیشتەجێ بوون و بوون بە جیرانی. هەروەها کڵێسایەک و میوانخانەیەکیشیان لەوێ دروست کرد. ناوبانگەکەی هەروەک ئاساییە بووە هۆی ئەوەی ئەوەندەیتر شاخوباڵ بە کەراماتەکەی بدەن و بە شاتوشووت گەورەی بکەنەوە. خەڵک لە ڕێگای زۆر دوورەوە نەخۆشەکانیان دەهێنا بۆ لای و لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە بۆ شیفای نەخۆشینەکانیان ودمی هەیە.

یەکەم شیفابەخشیی ئەو لە ساڵی هەشتەمی گۆشەنشینییەکەیدا بوو. شیفای بە مێرمنداڵێکی چوارده ساڵانە بەخشی کە دایکی هاتبوو بۆ لای و پێداگریی دەکرد کە باوەسێرگی دەست بە سەری منداڵەکەیدا بێنێ. باوەسێرگی قەت بە خەیاڵیشیدا نەدەهات کە بتوانێ کەسێک شیفا بدات. ئەو ئەم جۆرە خەیاڵانەی بە تاوانێکی گەورە دەزانی و پێی وا بوو بە هۆی خۆپەرستییەوەیە ئەگەر کەسێک دیعایەی ئەوە بکات. بەڵام دایکی کوڕە دەستی لە پاڕانەوە هەڵنەگرت و خۆی خست بە سەر کەوشەکانیدا و بە لالانەوە گوتی بۆچی



خەڵکی دیکەی شیفا داوە کەچی کاریگەریی ودمی پیرۆزی خۆی لە کوڕەکەی ئەو درێخی دەکات، مەسیحی لی کردە تکاکار کە دەستیان بە ڕووەوە نەنێ. کاتێ باوەسێرگی لە سەر ئەوە پێداگریی کرد کە شیفا تەنیا بە دەست خودایە، ژنە گوتی تەنیا داوا لە ئەو دەکات کە دەست بە سەری کوڕەکەیدا بێنێ و شیفای پێ ببەخشێ، گوتیشی کە دۆعای ئەو یەکاویەکە. باوەسێرگی نەچووە ژێر بار و خۆی کردەوە بە نێو حوجرەکەدا. بەڵام ڕۆژی دوایی (پایز بوو و شەوانە هەواکەی زۆر سارد بوو) کاتێک لە حوجرەکەی هاتە دەرێ تاکوو ئاو بێنێ، چاوی بەو ژنە بێچارەیە کەوت لەگەڵ کوڕە لاواز و زەردەڵەکەی هەروا لە بەر دەرگای حوجرەکەی ڕاوەستاون، لەگەڵ هاتنە دەرێ ژنە بەرەو پیری هات و دیسان دەستی کرد بە لالانەوە. ئەو کاتە نەقڵی قازییە زاڵمەکەی وەبیر هاتەوە و ئەگەرچی بەر لەوە دڵنیا بوو کە نابێ بچێتە ژێر باری ویستی ئەو ژنە، کەچی ئێستا دڕدۆنگییەک دڵی داگرت کە خۆشی پێی سەیر بوو ئەو ماوەیە دڵڕەقانە خۆی گرتووە و ویستی ژنەی بەجێ نەهێناوە. پاشان دەستی کرد بە دۆعا خوێندن و هێندە پاڕایەوە کە بڕیارێک لە دڵیدا شکڵی گرت و ناخی ڕووناک کردەوە. بڕیارەکەش ئەوە بوو کە ویستی ژنە بەجێبهێنێ، چونکە پێیوابوو ئیمانی ئەو دایکە لەوانەیە ببێتە هۆی نەجاتی جگەرگۆشەکەی و خۆشی لەو نێوانەدا تەنیا کەرەسەیەکی کەمبایەخە لە دەستی خودادا.

چوو بۆ لای ژنە و ئەوەی ئەو لێی دەویست کردی و دەستی بە سەری کوڕەدا هێنا و دۆعای بە سەردا خوێند.

ژنە لەگەڵ کوڕەکەی ڕۆیشتن و دوای مانگێک کوڕە چاک بۆوە. لەو ناوچەیە بوو بە دەنگۆ کە ودمی پیرۆزی پیری پاکداوێن باوەسێرگی (ئەوەش نازناوێکی تازە بوو) بۆ شیفای نەخۆشی یەکاویەکە. دوای ئەوە حەوتوویەک نەبوو نەخۆش و کەلەلا نەیەن بۆ لای و داوای شیفای لێ نەکەن. چونکە جارێک پێمل بووبوو ئیتر نەیدەتوانی یارمەتیی خەڵکی نەدات. دەستی بە سەری نەخۆشەکاندا دەهێنا و دۆعای بۆ دەکردن، زۆربەی نەخۆشەکان بە دۆعای ئەو چاک دەبوونەوە و ناوبانگی باوەسێرگی لە هەموو جێیەک دەنگی دایەوە.

بەم شێوەیە باوەسێرگی دوای ئەو نۆ ساڵەی کە لە پەرستگە ڕاییواردبوو، سێزدە ساڵ بە تەریکی و دوورەپەرێزی لەو حوجرەیەدا ژیانی بە سەر دەبرد. شاندی پەرستگە پیرێکی سەربەستیان پەیدا کردبوو کە زۆریان بڕوا پێی هەبوو. ڕیشێکی سپی و درێژی هەبوو. بەڵام مووی سەری، ئەگەرچی تەنک بووبوو، بەڵام هێشتا ڕەش و لوول بوو.



(٧)

چەند حەوتوویەک بوو کە بیرێکی بەردەوام مێشکی باوەسێرگیی داگرتبوو. ئەویش ئەوە بوو کە بڵێی کارێکی باش بێ پێملی پلە و پایەیەک بێ کە خۆی بە پێی مەیل و بە دڵخوازی خۆی قەبووڵی نەکردووە، بەڵکوو لە لایەن ئارخی ماندرێت و گەورەپیری پەرستگەوە بە سەریدا سەپاوە. ئەو حاڵەش دوای چاکبوونەوەی کوڕە مێرمنداڵە چاردە ساڵانەکە لە ناخیدا سەری هەڵدابوو. دوای ئەوە هەموو مانگێک و هەموو حەوتوو و ڕۆژێک هەستی دەکرد کە ژیانی خەریکە لە ناخەوە دەپووکێتەوە، بەرەبەرە لە نێو دەچێ و ژیانی ڕواڵەتی بایەخ پەیدا دەکا. ڕاست دەتگوت توورەکەیەکە کە هەڵیانگێڕابێتەوە.

باوەسێرگی بە چاوی خۆی دەیدی کە بۆتە ئامرازێک بۆ ڕاکێشانی سەرنجی زیارەتکەرانی پەرستگە، کە هەرکەس نیاز و داواکارییەکی لێی هەیە و هەر بەو هۆیەش پێشەواکانی پەرستگە بارودۆخێکیان بۆ ڕەخساندبوو کە ئاسوودەتر بێ. بۆ وێنە کارێکیان کردبوو کە ئەو بە کاری جەستەییەوە خۆی ماندوو نەکات و هەموو پێداویستییەکانی بۆ دابین دەکرا و لە ئەویان دەویست تەنیا ئەرکێک بەجێبێنێ، ئەویش ڕازی کردنی ئەو کەسانە بوو کە ئاتاجی دۆعا و پاڕانەوەی ئەو بوون و متفەرکیان لێی دەویست و هەر بەو نیازەش دەهاتن بۆ پەرستگاکە. بۆ کارئاسانی ڕۆژانێکیان بۆ دیاری کرد کە ئەو بتوانێ وەڵامدەرەوەی ویست و داخوازیی لەشبەبار و زیارەتکەران بێ.

ژووریکیان بۆ وەرگرتنی پیاوان تەرخان کرد و هەروەها شوێنێکی لاجامەدار بۆ ژنانی نیازمەند، کە بۆ زیارەت و دەست لێدانی جلەکانی هورووژمیان دەهێنا نەیدەن بە زەویدا و نەکەوێتە ژێر دەست و پێیان و ئەو بتوانێ بە شێوەیەکی شیاو دۆعایان بە سەردا بخوێنێ و تەبەڕوکیان بداتێ. پێیان دەگوت کە خەڵک پێویستییان پێیەتی و ئەو ئەگەر بیهەوێ ڕێز بۆ یاسای ئەشقی مەسیح دانێ، کە داوا لە هەمووان دەکا یەکتریان خۆش بوێ، ناتوانێ ئەو کەسانە لە دیتن و زیارەتی خۆی بێبەش بکات کە پێویستیان پێیەتی و خۆشیاندەوێ، خۆلادان لەو جۆرە مرۆڤە لێقەوماوانەش ئەوپەڕی دڵڕەقییە. بۆیە بە ناچاری قەبووڵی کرد. بەڵام هەرچی زیاتر پێملی ئەو ژیانە دەبوو زیاتر هەستی دەکرد ئەوەی لە کاکڵ و مانادایە دەبێتە توێکڵ و سەرچاوەی ئاوی ژیان لە دڵیدا وشک دەبێ و ئەوەی دەیکا زیاتر بۆ خەڵکە نەک بۆ خودا.

خەڵکی ئامۆژگاری دەکرد و بۆ ڕێگای ژیان ڕێنوێنیی دەکردن یان تەنیا دەستی تەبەڕوکی بە سەریاندا دەهێنا، دۆعای بۆ نەخۆش و لەشبەباران دەکرد یان گوێی بۆ ئەو خەڵکە ڕادەگرت کە سەبارەت بە شیفادان و تەبەڕوک و ئامۆژگارییە بەنرخەکانی سپاسیان لێ دەکرد و شوکرانەبژێر بوون. هەڵبەت نەیدەتوانی دڵخۆش و ڕازی نەبێ و گوێ نەدا بەو هەموو شوێندانان و کاریگەرییەی لە سەر خەڵک هەیبوو. پێی وا بوو چرایەکە خودا هەڵیکردووە و هەرچەندیش ئەو بیرە لە مێشکیدا زیاتر ڕەگاژۆی دەکرد، زیاتر هەستی دەکرد کە



ڕۆحی خودایی لە دڵی دوور دەکەوێتەوە و تیشکی هەقیقی کە لە سینیگدا بوو خەریکە وردە وردە دەکووژێتەوە. «کارەکانی من چەندەی لە بەر ڕەزای خودایە و چەندەی لە بەر خەڵکە؟» ئەوە پرسیارێک بوو کە بەردەوام ئازاری دەدا و دڵ و مێشکی ڕێکدەگوشی، بەڵام ئەو پرسیارەی بەبێ وەڵام دەهێشتەوە و نەک بەو هۆیەی کە هیچ وەڵامێکی بۆی نەبێ، بەڵکوو بەو هۆیە بوو کە نەیدەویست خۆی لە هەمبەر ئەو وەڵامەدا ببینێ و لەگەڵی تێبکەوێ. لە ناخی دڵیدا هەستی دەکرد کە شەیتان کارێکی کردووە کە هەستی خزمەت کردن بە خەڵک لە ڕۆحیدا جێگای ئەشقی خودا بگرێتەوە. هۆی ئەو هەستەش ئەوە بوو کە بەو ڕادەیەی لە ڕابردوودا دژوار بوو بۆی کە خەڵوەتەکەی لێ تێکبدەن و ئەو لە تەنیاییەکەی داببڕن ئێستا لە تەنیایی و دوورەپەرێزی بێزار بوو. ئەگەرچی کاتێک لەگەڵ نەخۆش و لێقەوماوان بەرەوڕوو دەبوو خەمەکانیان دڵتەنگی دەکرد بەڵام لە قووڵایی گیانیدا بە هاتنیان هەستی بە دڵخۆشی دەکرد و ئەو پەسن و تاریفاتەی ئەوانی زۆر بە لاوە شیرین بوو.

تەنانەت ئەو کاتەش کە بڕیاری دابوو خۆی لە خەڵک بەدوور بگرێ و ڕوویان لێ وەربگێڕێ، بە وردی بیری لە چۆنیەتیی ئەو بڕیارەی خوی کردبۆوە و لە هەموو لایەنێکەوە هەڵیسەنگاندبوو. کراس و پانتۆڵێک و قاپووت و کڵاوێکی لبادی پەیدا کردبوو و بیانووی ئەوە بوو کە ئەوانەی بۆ ئەو دەستەنگ و هەژارانە دەوێ کە دێن بۆ زیارەتی، بەڵام هەموویانی گلدایەوە و بە هیچ کەسی نەدان.

له بیری ئەوەدا بوو سەری بتاشێ و ئەو جلانە لەبەر بکات و ڕێگای دەشت و سەحرا بگرێتە بەر. بە خەیاڵ بوو سەرەتای ڕێگا بە مەودای سێسەد وێرست بە شەمەندەفەر بڕوات و دوای بڕینی ئەو مەودایە بە شەمەندەفەر، بە پێیان ڕێگای بیابان بگرێتە بەر و لەم گوندەوە بۆ ئەو گوند بڕوات، بەڵام دوودڵ بوو کە ڕۆیشتنی باشترە یان مانەوەی. سەرەتا زۆر دوودڵ بوو بەڵام دواتر دوودڵییەکەی ڕەوییەوە و ملی بۆ ڕەواڵە ئاساییەکەی پێشووی داخست و خۆی دایە دەست ئیبلیس و جلوبەرگە لادێییەکەی بۆ یادگاری هەڵگرت، تاکوو ئەو بیر و هەستانەی زەمانێک گرنگیی پێ دەدان، لەواندا ببینێ و دڵی پێیان ڕوون بێتەوە.

ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ ژمارەی زیارەتکەر و نەخۆش و لەشبەبار زیادی دەکرد و دەرفەتی بیر کردنەوە و چاوەدێری و دۆعا و تاعەتی بۆ نەهێشتبۆوە. هێندێ جار لە کاتی گەشبینی و هیواداریدا پێی وا بوو وەکوو خاکێک وایە کە سەردەمێک کانیاوێک لەوێدا هەڵقوڵیوە. «جۆگەلە ئاوێکی ڕووناک و گیانبەخش بوو کە بە ئارامی لە مندا ڕەوان بوو. ئەو کاتەی کە ژنە هەولی دا هەڵمخەڵەتێنێ. ئەوە ئاوی ژیانی ڕاستەقینە بوو.» باوەسێرگی زۆر جار بە هەیەجانەوە بیری لەو شەوە دەکردەوە کە «ئەو» (کە ئێستا بووبووە دایە ئاگنیا[24]) هەولی دابوو هەڵیفریوێنێ. ئەو ژنە ئەو شەوە لەو ئاوی ژیانەی نۆشی و زیندوو بۆوە. بەڵام لەو ڕۆژە بە دواوە هیچ ئاوێک لەو

24- Agnya



کانیاوە هەڵنەقوڵیبوو. ئەگەرچی توونی و سیوشکەهەڵاتووان دەهاتن و بە پاڵەپەستۆ یەکتریان دەدا دواوە و بە ئاواتی قومێک ئاو بوون لەو کانیاوە، تاکوو پێی زیندوو ببنەوە، چونکە ئاوەکە وشکاوی هاتبوو و جگە لە قوڕ و زێلاقەیەک کە لە ژێر پێیاندا جڵقەی دەهات هیچی تریان دەست نەدەکەوت. لە کاتی گەشبینی و هیواداریدا کە ئێستا زۆر تووشی ئەو حاڵەتە دەبوو، ئاوای بیر دەکردەوە. بەڵام حاڵەتی ئاساییی ئەو شەکەتی بوو و لە ناخەوە دڵی بە خۆی دەسووتا.

بەهار هات. شەوی بەر لە جێژنی پەنجاهە[٢٥]، باوەسێرگی لە کڵێسای نزیک حوجرەکەی کە ئەویش وەک زاخەکێوەکە دابڕابوو، ڕێوڕەسمی عیشای ڕەببانیی بەجێهێنا. ئەم کڵێسایە زۆر چکۆلە بوو، تەنیا جێی بیست و دوو سێ کەس دەبۆوە و پڕ بوو لە نوێژخوێن کە هەموویان مڵکدار و بازرگانی دەوڵەمەند بوون. باوەسێرگی دەرگای حوجرەکەی بۆ هەموو کەس ئاواڵە بوو، بەڵام ئەو ڕاهیبەی کە بۆ خزمەتی ئەو دەستنیشان کرابوو و ڕاهیبێکی تریش کە وەکوو کێشک هەموو ڕۆژێ لە پەرستگەوە دەهات، ڕێگای هەژار وبێئەنواکانیان نەدەدا بچنە ژووری. ئاپۆرەی زیارەتکەران کە نزیکەی هەشتا کەس دەبوون و زیاتریان ژن بوون لە دەرەوەی

٢- جێژنێکە کە جوولەکە و نەسرانییەکان، هەرکام بە شێوەی خۆیان، حەوتەمین یەکشەممەی دوای جێژنی پاک بەڕێوەی دەبەن. لە لای مەسیحییەکانیش ڕێزگرتنە لە خۆیابوونی ڕۆحی پیرۆز بە سەر حەوارییوونی مەسیحدا.

کڵێسا ڕاوەستابوون و چاوەڕێی هاتنە دەرەوەی باوەسێرگی بوون تاکوو تەبەڕوکیان بداتێ. باوەسێرگی ڕێوڕەسمی عیشای ڕەببانیی بەجێهێنا و چوو لە سەر گۆڕی پیرە دژکامەکەی بەر لە خۆی دۆعا بخوێنێ کە لە نێو ئەو حوجرەیەدا نیشتەجێ بوو و هەر لەوێشدا ناشتبوویان بە دالانی زاخەکەدا ڕۆیشت و نوێژکەران بە دوایدا، لە ناکاو لاقی تێکەڵ هات و سەرەنگرێ بوو. ئەگەر ئەو بازرگانەی پشتسەری و ڕاهیبێکی کە ئەرکی جانکوشی لەو کڵێسایە بەجێدەهێنا لەوێ نەبوایەن و نەیانگرتایە دەکەوت بە زەویدا و جێیەکی دەشکا.

ژنەکان قیژاندیان: «ئەیەڕۆ ئەوە چبوو باوکە گیان، باوەسێرگی دەردی تۆ لە گیانم، وەی خودایە گیان، بڕوانە ڕەنگی بۆتە چۆڕی شیر!»

بەڵام باوەسێرگی خێرا وەخۆ هاتەوە و ئەگەرچی ڕەنگی زۆر پەڕیبوو، ڕاهیب و بازرگانەکەی لە خۆی دوور خستەوە و هەروا درێژەی بە سروود و دۆعا خوێندن دا. باوە سراپیۆن[26] و سوختەکان و خاتوو سۆفیا ئیڤانۆڤناش، کە لە نزیک حوجرەکەی باوەسێرگی نیشتەجێ بووبوون و چاوەدێرییان لێ دەکرد، داوایان لێ کرد کۆتایی بە ڕێوڕەسمەکە بهێنێ.

26- Cerapyon



بەڵام باوەسێرگی بە بزەیەکەوە کە بە ئاستەم لە ژێر سمێڵیەوە دەرکەوت گوتی: «نا، هیچ نەبوو، هیچ نەبوو، عیشای ڕەببانی بۆ ئەوە نابێ بیبڕی!»

لە دڵی خۆشیدا گوتی: «ئەوە ئەرکی قەدیسەکانە، جگە لەوە هیچ کارێکی تر ناکەن!»

لە پشت سەریشیەوە گوێی لە دەنگی سۆفیا ئیڤانۆڤنا بوو کە گوتی: «وەی، چەندە پیاوێکی مەزن و پیرۆزە! ڕاست فریشتەیەکی خودایە بە ڕواڵەتی مرۆڤەوە!» بازرگانێکیش کە لەوێ بوو و دەستی باوەسێرگیی گرتبوو و نەیهێشتبوو بکەوێ، نەیتوانی بێدەنگ بێ و وتەکەی ئەوی دووپات کردەوە. باوەسێرگی قسەی ئەو کەسانەی دەبیست کە هەوڵیان دەدا پێملی بکەن کە کۆتایی بە نوێژەکە بهێنێ، بەڵام گوێی بەو قسانە نەدەبزوا و درێژەی بە کارەکەی خۆی دەدا. دیسان بە دالانی باریکی زاخەکەدا بە کۆمەڵ تێپەڕین و گەڕانەوە بۆ کڵێسە چکۆلەکە و لەوێ باوەسێرگی بەشی کۆتایی نوێژی شێوانی تۆزێ کورت کردەوە و دوایی پێ هێنا.

دوای عیشای ڕەببانی ئەو کەسانەی لەوێ بوون یەک بە یەک تەبەڕوکی پێدان و چوو بۆ لای کورسیی بەردەرگای زاخەکە کە لە ژێر دار نارەوەنێک داندرابوو. دەیویست تۆزێ پشوو بدا و هێندێک هەوای تازە هەڵمژێ. هەستی دەکرد کە ئەو کارە زۆر پێویستە بۆی، بەڵام کە لە زاخەکە چووە دەرێ ءاپۆرەی خەڵکی چاوەڕوان و تامەزرۆ هورووژمیان بۆ هێنا و هەموویان خوازیاری تەبەڕوک بوون

و داوای یارمەتی و ڕێنێونییان دەکرد. هێندێک لەو ژنانەی بۆ زیارەت هاتبوون کار و ژیانیان تەنیا ئەوە بوو لەم پەرستگە بۆ ئەو پەرستکە و لەلای ئەم پیرەوە بۆلای پیرێکی تر دەگەڕان. بۆ سەر هەموو مەرقەد و چاک و پیرێک دەچوون و تامەزرۆیانە و بە دڵێکی پڕ لە خولیاوە زیارەتیان دەکرد. باوەسێرگی لەگەڵ شێوەی ژیانی ئەو جۆرە کەسانە ئاشنا بوو، کە ئەوەش داب و ڕەسمێکی زۆر ناڕۆحانی و ڕواڵەتی و لە ڕاستیدا ساردوسڕ بوو. پیاوانێکی زیارەتکەریش هەبوون کە ئەوانیش زیاتر سەربازی لە خزمەت دەرکراو و بێزار لە ماڵ و جێ بوون، هەروەها پیرەپیاوانی کەلەلا و هەمیشە سەرخۆش کە لەم پەرستگەوە بۆ ئەو پەرستگە دەچوون و هەگبەی خۆیان لە کۆڵ دەنا و قەستیان تەنیا ئەوە بوو زگی خۆیان تێر بکەن. بەڵام ژن و پیاوی گوندنشین و وەرزێریش هەبوون کە بە داخوازی و چاوەڕوانیی خۆپەسندانە دەیانویست لە چنگ ئازار و کێشەی ژیان ڕزگاریان ببێ و گیروگرفتەکانیان چارەسەر بکەن و بۆیان ڕوون بێتەوە کە بە قازانجییانە یان نا کە کچەکەیان بدەن بە فلان کوڕ، یان فلان دووکان بە ئیجارە بگرن و پەڵە زەوییەک بکڕن. یان باری ئەو تاوانە لە سەر شانی خۆیان لابەن کە بە دەم خەوەوە کەوتوون بە سەر منداڵێکی ساوادا و خنکاندوویانە یان بە هۆی پێوەندیی ناڕەوای جنسییەوە منداڵێکیان بووە. باوەسێرگی لە زووەوە لە تەواوی ئەو کێشە و ئاریشانە ئاگادار بوو و زۆر بە لایەوە سەیر و سەرنجڕاکێش نەبوون. ئەو دەیزانی کە ئەو مرۆڤانە هیچ شتێکی تازەی فێر ناکەن و



هیچ هەستێکی ئایینی لە ناخیدا هەڵناگیرسێنن. بەڵام بە دیتنیان شادمان بوو چونکە دەیدی ئەوانە کەسانێکن کە پێویستیان بە تەبەڕوک و قسەکانی ئەو هەیە و خۆشەویستە لە لایان و هەر بەو هۆیەش ئەگەرچی لێیان بێزار بوو، بەڵام لە نێو ئەواندا هەستی بە دڵخۆشی دەکرد. باوە سراپیۆن دەیویست ئەو هەموو خەڵکە جاڕزکەرە لە دەوری حوجرەکەی باوەسێرگی دوور بخاتەوە و پێی دەگوتن باوەسێرگی ماندووە. بەڵام ئەو کەلامی ئینجیلی وەبیر هاتەوە کە مەبنە بەرگری ئەوانە (مناڵەکان) با لێم نزیک ببنەوە. لەوەی کە ئەو بیرە بە مێشکیدا هات خەم دڵی داگرت و گوتی: «پێشیان پێ مەگرن، با بێن بۆ لام.»

لە جێی خۆی هەستا و چوو بۆ لای ئەو لاجامەیە کە ئاپۆرەی خەڵک لەو دیویەوە تێک دەقرقژان و بە شان و ملی یەکتریدا هەڵدەڕووچکان. دەستی کرد بە پێدانی تەبەڕوک بەو خەڵکە تامەزرۆیە و وەڵامی پرسیارەکانی دانەوە، دەنگی جۆرێک بوو کە خۆشی بەو بێگوڕوتینییەی دڵی گیرا و بەزەیی بە خۆیدا هات. بەڵام ئەگەرچی دەیویست گوێ لە دانە دانەیان بگرێ و نیازیان بەجێ بهێنێ، بەڵام نەیدەتوانی و دەرۆستی ئەو کارە نەدەهات. دیسان بەرچاوی تاریک بوو. ئەژنۆی لەرزی و سەری لە گێژەوە هات، ناچار بوو دەست بە لاجامەکەوە بگرێ. دیسان هەستی کرد خوێن بەرەو سەری دادەبەرزێ. سەرەتا ڕەنگی هەڵبزرکا و پاشان سوور هەڵگەڕا.

گوتی: «بەڵێ، وا دیارە بیهێڵمەوە بۆ سبەینێ باشە. ئەمڕۆ ئیتر ناتوانم.» بە سەریەکەوە تەبەڕوکی دا بە هەموویان و گەڕایەوە بۆ لای کورسییەکە. بازرگانەکە دیسان قۆڵی گرت و لە سەر کورسییەکە داینیشاند.

دەنگی پاڕانەوەیەک لە نێو ئاپۆرەی خەڵکەکەوە بەرز بۆوە: «باوە، بە تەنیا جێمان مەهێڵە! باوە گیان، بەبێ تۆ بەدبەخت و چارەڕەش دەبین!»

بازرگان لەگەڵ دانیشاندنی باوەسێرگی لەسەر کورسیی ژێر نارەوەنەکە، ئەرکی ئاگاداریی ئەوی وەئەستۆ گرت و بەرپرسانە بەرگریی لێ دەکرد و نەیدەهێشت خەڵکەکە هورووژمی بۆ بێنن، هەڵبەت زۆر بە هێواشی قسەی دەکرد، بە جۆرێک کە ئەوەی دەیگوت باوەسێرگی نەیدەبیست. بەڵام لەبزی قسە کردنەکەی تووڕە و حاکمانە بوو.

«بڕۆن، دوور کەونەوە! تەبەڕوکی پێدان، ئیتر چیتان دەوێ؟ یاڵڵا، زووکەن، بەرۆکمان بەردەن! ئەگەر نەڕۆن وەبەر زەبری قامچیتان دەدەم! دەی بڕۆ، دەی پووریێ بڕۆ! بەو مەچەکبەندە ڕەشەتەوە. زوو کە دەی، لە بەرچاوم ون بە! تۆ بۆ هەر دێیە پێشێ؟ بڕۆ دواوە، ئیتر تەواو بوو. خودا یار بێ سبەینێ وەرنەوە! ئەمڕۆ ئیترتەواو بوو، باوەسێرگی توانایی نەماوە، بڕۆن بە دوای کاری خۆتاندا، تەواو!»

پیرێژنێک گوتی: «باوکیلە، تەنیا لێم گەڕێ، با بە تاقە ڕوانینێک چاوانم بەو ڕوخسارە نوورانییەی ڕوون بێتەوە.»



«گوتم بڕۆ، مەیە پێشێ! من چاک دەزانم ئەو تاقە ڕوانینەت یانی چی!»

باوەسێرگی تێگەیشت کە کابرای تاجر بە توندی لەگەڵ خەڵک دەجووڵێتەوە و بە دەنگێک کە دەتگوت لە ناخی بیرێکەوە دێتە دەرێ، بە پارێزگارەکەی خۆی گوت کە بە تووڕەیی خەڵک نەتارێنێ. دەیزانی کە بازرگان گوێ بە قسەی ئەو نادات و هەروا لەگەڵ خەڵک بە تووڕەیی دەجووڵێتەوە و خۆشی حەزی دەکرد بە تەنیا بمێنێتەوە و پشوو بدات، بەڵام پارێزگارەکەی نارد کە بەو پەیامە دڵخۆشیی خەڵک بداتەوە.

کابرای تاجر وەڵامی دایەوە: «باشە، باشە توندوتیژی ناکەم. تەنیا داوایان لێدەکەم بارودۆخی جەنابتان لە بەرچاو بگرن. ئاخر ئێوە نازانن ئەو خەڵکە، دوور لە گیانت، هەتا نەتانێرن بۆ بەهەشت دەستبەردار نابن. بە تۆزقاڵ ڕەحم و بەزەیان لە دڵدا نییە. تەنیا لە بیری خۆیاندان... خۆ بە زمانی خۆش پێم گوتن ئەمڕۆ ئیتر تەواو بوو. سبەینێ وەرنەوە، بەڵام خۆ ئەو خەڵکە قسەیان بە گوێدا ناچێ.»

بازرگان ئەو قسەیەی کرد و هەموو خەڵکەکەی تاراند.

ئەو لەو کارەدا زۆری جوامێری و غیرەت لە خۆی نیشان دا، چونکە لە هەموو کارێکدا لایەنگری نەزم بوو و حەزی دەکرد دەسەڵاتی خۆی بنوێنێ و خەڵکەکە لە دەوری باوەسێرگی دوور خاتەوە. بەڵام زیاتر لەوەش هۆی ئەوە بوو بە چاوی ئێرەییەوە لە باوەسێرگیی دەڕوانی. ئەو بازرگانە بێوەپیاو بوو و تاقانە کچەکەشی

نەخۆش و بەبێ مێرد بوو. کچەکەی لە هەزار و چوارسەد وێرست مەوداوە هێنابوو تاکوو باوەسێرگی شیفای بدا. دوو ساڵ بوو ئەو کچەی بە هیوای چارەسەری بە هەموو لایەکدا گێڕابوو. سەرەتا بردبووی بۆ زانستگای ناوەندی پارێزگا، بەڵام ئاکامێکی نەبوو، پاشان بردی بۆ لای ساراما کە پیاوێکی وەرزێڕ بوو و دەیانگوت ودمی هەیە و لە لای ئەو تۆزێ نەخۆشییەکەی سووک بووبوو. پاشان بردبووی بۆ مۆسکۆ و لەوێ پیشان دوکتۆرێکی بەناوبانگی دابوو و پارەیەکی زۆری لە پێدا خەرج کردبوو. بەڵام هەوڵەکانی هەمووی بەبێ ئاکام مابوونەوە. ئێستا بیستبووی کە باوەسێرگی نەخۆش و لەشبەباران شیفا دەدا، بۆیە هانای بۆ ئەویش هێنابوو. کاتێک هەموو خوازیارەکانی دوور خستەوە، بە تەنیا گەڕایەوە بۆ لای باوەسێرگی و بەبێ هیچ وتە و پێشەکییەک لە بەرپێیدا چۆکی دادا و بە دەنگی بەرز گوتی: «باوکی مەزن و پیرۆز، هانام بۆ تۆ هێناوە، تکات لێدەکەم کچەکەم شیفا بدە. دەزانم پڕکێشی دەکەم و ڕووم هەڵماڵیوە، بەڵام ناچارم و هانام بۆ تو هێناوە، جا ئەوە سەری من و ئەوەش خاکی بەرپێی تۆ.» بە نیشانەی پاڕانەوە هەردوو لەپی دەستی وەک دوو پیاڵە لە سەریەک دانا و ئەو کارانەی جۆرێک دەکرد کە دەتگوت ڕەسم و ڕێسای ئەو کارە وای حوکم لێدەکا و کاتێ داواکاری و لالانەوەی بۆ ماریجەی کچەکەی پیاو دەبێ بەو شێوەیە هەڵسوکەوت بکات نەک بە شێوەیەکی تر. ئەو ئاکار و هەڵسوکەوتەی هێندە نیشاندەری دڵنیاییەکەی بوو کە باوەسێرگیش



پێی وا بوو ئەوەی ئەو دەیهەوێ تەنیا بەو شێوەیە بەیان دەکرێ. بۆیە پیلی گرت و دوای ئەوەی لە سەر عەرزەکە هەڵیساندەوە داوای لێکرد بۆی ڕوون بکاتەوە کە دەردی کچەکەی چییە. بازرگان گوتی کچەکەی بیست و دوو ساڵی تەمەنە و ساڵی ڕابردوو کاتی مردنی لەناکاوی دایکی نەخۆش کەوتووە، بەردەوام دەناڵێنێ و لە ماوەی ئەم دوو ساڵەدا زۆری ئازار چێشتووە. هەزار و چوارسەد وێرستی ڕێگا بڕیوە و کچەکەی هێناوە بۆ ئێرە، لە مسافیرخانە بەجێی هێشتووە و هاتووە بۆ خزمەتی تاکوو هەرکاتێ باوەسێرگی ڕازی بوو بیهێنێتە خزمەتی. بە ڕۆژدا لە ژوورەکەی نایەتە دەرێ چونکە لە ڕووناکی دەترسێ و تەنیا دوای ئاوابوونی ڕۆژ لە ژوورەکەی دێتە دەرێ.

باوەسێرگی پرسیی: «زۆر لاوازە؟»

«نا، لاوازییەکەی زۆر لە چاو نادا، ئەو جۆرەی کە دوکتۆر دەیگوت لاوازییەکەی تەنیا بە هۆی بارودۆخی ڕەوانییەوەیە. ئەگەر دەستوور بفەرمووی هەر ئەمڕۆ بیهێنم بەبێ ڕاوەستان دەچم و دەیهێنم. باوکی پیرۆز، تکات لێ دەکەم دڵی مردووی باوکێکی خەملەبەر زیندوو بکەنەوە. کارێک بکەن جەرگم نەسووتێ و ڕێچکەی بنەماڵەکەم کوێر نەبێتەوە. کچەکەم بە دۆعاکانی خۆت لە مەرگ ڕزگار بکە.»

بازرگان ئەوەی گوت و دیسان لە بەردەمی باوەسێرگی چۆکی دادا و وەک پێشوو دەستی لە سەر یەک دانا و لە بەردەمی خۆی ڕایگرت و ملی خوار کردەوە و بە شێوەیەکی بێجووڵە مایەوە.

باوەسێرگی دیسان پێی گوت کە هەستێ و بیر لە خۆی بکاتەوە کە کارەکەی چەندە دژوارە و بەو حاڵەشەوە بەوپەڕی ڕەزایەت و ملکەچییەوە ئەنجامی دەدات، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و دوای بێدەنگییەکی چەند چرکەیی گوتی: «باشە، ئەمشەو کچەکەت بێنە. من دۆعای بە سەردا دەخوێنم. بەڵام ئێستا زۆر ماندووم.» پێڵووی چاوی لە سەریەک دانا و گوتیشی: «ئاگادارت دەکەمەوە.»

بازرگان لە سەر نووکی لاقی و بە پێدزە دوور کەوتەوە. ئەو دەیویست ترپەی پێی نەبێتە هۆی ئازاری باوەسێرگی، بەڵام هەر ئەوە بووە هۆی ئەوەی سیرەی چەکمەکانی لە سەر زیخەکە زیاتر بێ و گوێچکە ئازار بدات. ڕۆیشت و باوەسێرگیی بە تەنیا بەجێهێشت.

ژیانی باوەسێرگی سەرلەبەری نوێژ و تاعەت و خزمەتکردن بە کڵێسە بوو، هەروەها بە دەنگەوەچوونی خوازیار و لێقەوماوان و پاڕانەوە بۆ ڕزگاری و چارەسەریان. بەڵام ئەمڕۆ زۆری بەلاوە دژوار بوو. بەیانی یەکێک لە پایەبەرزانی وەرگرتبوو کە لە ڕێگایەکی دورەوە هاتبوو و ماوەیەکی زۆر لەگەڵ ئەو پەیڤیبوو. پاشان خاتوونێکی وەرگرتبوو کە لەگەڵ کوڕەکەی هاتبوون، ئەو کوڕە مامۆستای زانکۆ بوو، لاوێکی لادین بوو لەسەر پێداگریی دایکی، کە ژنێکی زۆر دیندار بوو و دڵی لێوڕێژ بوو لە سۆز و ئەمەگ دەرهەق بە باوەسێرگی هاتبوو. ژنە لەبەر باوەسێرگی پاڕایەوە کە لەگەڵ کوڕەکەی بدوێ و بەرەو ڕێگای ڕاست ڕێنموونی بکات، پەیڤین لەگەڵ کوڕە زۆر ناخۆش و جاڕزکەر بوو. مامۆستای لاو دیار بوو حەز



ناکات لەگەڵ پیاوی ڕوحانی باخێوێ و هەرچی ئەو دەیگوت پەسندی دەکرد و دەتگوت ئەو بە شیاوی باس و ئاخافتن لەگەڵ خۆی نازانێ. باوەسێرگی دەیدی کە کوڕە ئیمانی بە خودا نییە و لەگەڵ ئەوەشدا دڵخۆش و بێخەم و ئاسوودەیە. بیرهێنانەوەی ئەو دیدارەش زۆر تاڵ و ناخۆش بوو بە لایەوە.

جانکوشی چاوەدێری ئەو گوتی: «حەزت لە خواردنە بیهێنمە خزمەتتان باوە گیان؟»

«خراپ نییە، بڕێک بێنە!»

جانکوش چوو بۆ حوجرەکەی باوەسێرگی کە دە هەنگاو لە دەرگای زاخەکە دوور بوو و باوەسێرگی لەوێ بە تەنیا مایەوە.

سەردەمێک باوەسێرگی بە تەنیا لە خەڵوەتی خۆیدا بوو و هەموو کارەکانی خۆی دەیکرد و خواردنەکەشی نانی جۆی متفەرککراو بوو، بەڵام ئێستا توانایی ئەو کارانەی نەمابوو، پێیان سەلماندبوو کە ئەو هەقی نییە باری لەشساغیی خۆی لە بەرچاو نەگرێ و خۆراکی بەبێ گۆشتیان بۆ ساز دەکرد کە تایبەتی ماوەی ڕۆژوو گرتنەکەی بوو، بەڵام وزەبەخش بوو. ئەو لەو خۆراکانەی دەخوارد بەڵام کەمی دەخوارد، ئەگەرچی زۆر بە ئیشتیاوە دەیخوارد و چێژی لە خواردن وەردەگرت. بەڵام ئێستا وەک ڕابردوو نەمابوو کە لە خواردن بێزار بوو و چێژ وەرگرتنی لە خواردن بە تاوان دەزانی. ئەمڕۆش زۆر بە چێژەوە خواردنەکەی خوارد. ژەمە خۆراکەکەشی تۆزێ سووپی گەنمەڕەشە و پەرداخێک چایی و لەتێک نانی سپی بوو.

جانکوش ڕۆیشت و ئەو لە سەر کورسیی ژێر دار نارەوەنەکە بە تەنیا مایەوە.

بەهار بوو و ئێوارەیەکی زۆر خۆش و فێنک. داری تووس و سپیدار و نارەوەن و بەڕوو کراسی تازەی گەڵایان لەبەر کردبوو. بنجی بەڵاڵووکە کێویلە لە پشت نارەوەنەکەوە بە چرۆی پشکووتووی سپی خۆی داپۆشیبوو و هێشتا پەلکی ناسکی گوڵە سپییەکانی نەوەریبوو. چەند بولبول، یەکیان زۆر نزیک و دوو سێ دانەی تریشیان لە خوارترەوە لە نێو لکوپۆپی دەوەنەکانی قەراغ ڕووبار، سەرەتا هێندێکیان جیکەجیک کرد و پاشان دەستیان کرد بە خوێندن. لە لای چۆمەکەوە و لە مەودایەکی دوورەوە، دەنگی چەند کرێکار دەهات کە گۆرانییان دەگوت و دیار بوو لە مەزرا دەگەڕانەوە. خۆر لە پشت دارستانەکەوە ئاوا بوو و تیشکی مەیلەو زەردی لە نێوان پەردەی ئاماڵسەوزی دارەکانەوە ترووسکەی دەهات. لەو لایەوە هەموو شتێک تەواو سەوزێکی کاڵ و لە لایەکی تریشەوە، یانی لای نارەوەنەکەوە، سەوزێکی تۆخ بوو. قسقانج بە باڵی قورسەوە دەفڕین و کاتێک خۆیان لە شتێک دەدا، تڵپ دەکەوتن بە زەویدا.

باوەسێرگی کاتێک شێوەکەی خوارد دەستی کرد بە دۆعا خوێندن لە دڵی خۆیدا و لە پەستا دۆعاکەی دووپات دەکردەوە. «عیسا مەسیح، کوڕی خودا، ڕەحممان پێ بکە!» پاشان لە مەزامیر سروودێکی خوێند و لەو سەروبەندەدا چۆلەکەیەک لە نێو دەوەنێک دەرپەڕی، لەسەر عەرزەکە نیشتەوە و بە قنەقنە و جریوەجریو لێی



نزیک بۆوە، بەڵام لە ناکاو لە شتێک ترسا و هەڵفڕییەوە. باوەسێرگی دۆعایەکی دەخوێند و لەودا باسی تەرکەدنیایی خۆی دەکرد بەڵام زۆر بەپەلە کۆتایی پێهێنا تاکوو کەسێک بنێرێ بە دوای بازرگانەکەدا تاکوو کچە نەخۆشەکەی بێنێ. لەخۆڕا هۆگری کاری ئەو کیژە بووبوو. بۆیە هۆگری بووبوو چونکە جیاوازییەکی تێدابوو. تازە بوو بە لایەوە، تازەییەکەشی ئەوە بوو کە باوکی و کچەکە خۆشی هەردووکیان ئەویان بە پیاوێکی پیرۆز و خاوەن ودم دەزانی و پێیان وابوو دۆعاکەی گیرا دەبێ و یەکاویەکە. ئەو خۆی حاشای لەو توانایە دەکرد بەڵام لە ناخیدا ئەوەی بە ڕاست دەزانی و بڕوای بە خۆی بوو.

زۆر جار خۆشی تووشی سەرسووڕمان دەبوو کە چۆن بوو ئەو، ستێپان کاساتسکی، توانیویەتی ببێتە پیاوچاکێکی ئاوا بەرجەستە و خاوەن ودم و پەرجۆ.

بەڵام گومانی لەوە نەبوو کە پەرجۆی لە دەست دێ و تواناییی ئەوەی هەیە. چونکە نەیدەتوانی ئەو پەرجۆیانەی کە بە چاوی خۆی دیبووی، بڕوای پێ نەکات. لە یەکەمیانەوە کە مێرمنداڵێکی کز و زەردەڵ بوو هەتا دوایین کەسیان کە پیرێژنێکی کوێر بوو و بە دۆعای ئەو سۆمای چاوی بە دەست هێنابۆوە.

ئەگەرچی سەیر دەهاتە بەرچاو. بەڵام شتێکی ڕاستەقینە بوو. کچی کابرای بازرگانیش بەو هۆیە سەرنجی ئەوی ڕاکێشابوو چونکە کەسایەتییەکی تازە بوو. ژنێکی لاو و گەنج بوو کە باوەڕی پێ دەکرد

و ئیمانی پێی هەبوو، هەروەها بەو هۆیەی کە فرسەتێکی تر بوو کە تواناییی شیفابەخشیی خۆی بنوێنێ و بناغەی ناوبانگ و گەورەیی خۆی پتەوتر بکا. لە دڵی خۆیدا گوتی: «خەڵک هەزاران وێرست ڕێگا دەبڕن هەتا بێن بۆ لای من و گوزارشتی کارەکانی من لە ڕۆژنامەکاندا دەنووسن، تێزار لە کاری من ئاگادار دەبێ و ناوبانگی تواناییەکانی من سەرانسەری ئەورووپا دەگرێتەوە، ئەورووپای کافر.[٢٧]» لە ناکاویش بۆ ئەو شایی بەخۆ بوونەی خۆی هەستی بە شەرمەزاری کرد و دیسان دەستی کردەوە بە دۆعا خوێندن و پاڕانەوە. «خودایە، پاشای مەزنی ئاسمانەکان، هەر تۆی کە سوکنایی بە دڵە پڕژان و بریندارەکان دەبەخشی، هەر تۆی ڕۆحی ڕاستەقینە، لە دڵی ئێمەدا نیشتەجێ بە. ئێمە لە چەپەڵی و تاوان پاک بکەوە و ڕزگارمان بکە لە ناوبانگپەرستی کە تەنیا لە مرۆڤی کەم جیکەڵدانە دەوەشێتەوە و دەبێتە هۆی گومڕایی و چەواشە بوون.» ئەو دۆعایەی دووپات کردەوە و وەبیری هاتەوە کە چەندە لەو چەشنە دۆعایانەی کردووە و هەتا چ ڕادەیەک بۆتە مایەی خۆبینی و هەوا لێبڵیند بوون. دۆعاکانی ئەو بۆ خەڵکی پەرجۆی خولڤاندووە، بەڵام نەیتوانیوە خۆی لە تەڵەی خەیاڵە سووک و چرووکەکانی خۆی ڕزگار بکا.

١- بە پێی ئایینی ئۆرتۆدۆکس (ئیمانی ڕاست) ئایینزاکانی تری مەسیح و بە شێوەی سەرەتایی دینەکانی جگە لە دینی مەسیح، هەموویان بانگەشەی کوفرن.



ئەو دۆعاکانی خۆی لە سەرەتای گۆشەنشینیدا وەبیر هاتەوە. سەردەمێک بوو کە لە خودای دەویست پاکی و خاکەڕایی و ئەشقی خۆی بە دڵی ئەو ببەخشێ و هەروەها وەبیریشی هاتەوە کە پێی وا بوو خودا هەموو ئاواتەکانی بەجێ دێنێ. ئەو سەردەمێک پاک بووە، قامکی خۆی بە تەور قرتاندووە. نووکی چرچی قامکە بڕاوەکەی هەڵێنا و ماچی کرد. بە بیریدا هات کاتێکیش کە بە هۆی تاوانەوە لە خۆی بێزار بووە پاک و بەدوور لە هەوا و هەوەس بووە و کاتێکیش کە سەربازێکی پیری مەستی وەرگرت کە داوای خێری دەکرد، یان ئەو کاتەی پێخەفەکەی خۆی دا بە ژنێک کە قەستی فریودانی ئەو بوو، دڵی لێوڕێژ لە ئەشق بووە. بەڵام ئێستا؟ یانی کەسێکی خۆش دەویست؟ یانی سۆڤیا ئیڤانۆڤنای خۆشدەویست؟ باوکە سراپیۆنی خۆشدەویست؟ یانی دەرهەق بە هەموو ئەو کەسانەی کە ئەمڕۆ هاتبوون بۆ سەردانی، دەرهەق بەو لاوە بیرمەندە، کە ئەو ئاوا زانایانە قسەی لەگەڵ کردبوو تاکوو ڕادەی زانستی خۆی پێ بنوێنێ و تاکوو ئەو بزانێ هەوڵی ڕوحانیی ئەو نەبۆتە هۆی ئەوەی لە فرەزانی بەری بێ، دەرهەق بە هەموو ئەوانە یانی بەڕاستی ئەشقی لە دڵدا بوو؟ خوشەویستی و ئەشقی ئەوانی دەرهەق بە خۆی هەست پێدەکرد و زۆری پێخۆش بوو، پێویستی بەو خۆشەویستییە هەبوو، بەڵام خۆی دەرهەق بە ئەوان ئەو ئەشقەی لە دڵدا نەبوو. دڵی لە ئەشق خاڵی بوو. لە خاکەڕایی و جوامێری و پاکیش بەری بوو. دڵخۆش بوو کە بازرگان پێی گوتبوو کچەکەی بیست و دوو ساڵانە و

ئەو دەیویست بزانێ جوان و شۆخوشەنگە یان نا؟ بۆیەش لە بازرگانی پرسی کە کچەکەی لاواز بووە یان نا، مەبەستی ئەوە بوو بزانێ نەخۆشی، جوانی و دڵڕفێنییەکەی زایە نەکردووە!

لە دڵی خۆیدا گوتی: «یانی بەڕاستی من هەتا ئەو ڕادەیە داکشاوم؟ خودایە یارمەتیم بدە. جارێکی تر لەو چاڵی سووکییە دەرمهێنە. هێزی خۆڕاگری و بە پێوە ڕاوەستانم پێ ببەخشە. خودایە، خودایە گیان.» هەردوو دەستی لە سەریەک دانا و دەستی کرد بە دۆعا کردن. بولبولەکان گاڵەیان دەکرد. قسقانجێک بەرەو لای ئەو فڕی و بە پشت ملیدا هەڵگەڕا. ئەو خێرا دەستی برد و خستییە خوارێ. «یانی ئەو بەڕاستی هەیە؟ ئەگەر من لە دەرگایەکی لە دەرەوە داخراو بدەم چی؟.. قوفڵی دەرەوەی دەرگاکە دیارە. ئەگەر چاوم هەبوایە دەمتوانی بیبینم. قوفڵەکەش ئەم بولبولانە و ئەم قسقانجە زێڕینانەن.. قوفڵ ئەم سروشتەیە و من ئەو نیشانەیە نابینم. لەوانەیە ئەو لاوەی ئەمڕۆ بەیانی ڕاست بکا!» بە دەنگی بەرز دەستی کرد بە دۆعا کردن، ماوەیەکی زۆر لەبەر خۆیەوە ورتەی هات، هەتا ئەو بیرانە لە زەینی چوونە دەرێ و ئەو دیسان هێمنایەتی و دڵنیایی خۆی وەدەست هێنایەوە. لە دەرگای دا و بەو جانکوشەی گوت کە هاتە دەرەوە: «لێگەڕێ با ئەو بازرگانە و کچەکەی بێنە ژوورێ.»

بازرگان کە دەستی کچەکەی گرتبوو هات و کچە جوانەکەی بە باوەسێرگی سپارد و خۆی بە پەلە چووە دەرێ.



کچێکی قژ زێڕین و لەڕادە بەدەر سپی و ناسک، ئەندامێکی زۆر لەبار و ڕێکوپێک، دڵڕفێن و نەرمونیان، ڕوخسارە منداڵانەکەشی ترسێکی پێوە دیار بوو، سمت و مەمکی زۆر خڕ و پڕ و جوان و هەوەسورووژێن بوو. باوەسێرگی لە سەر کورسییەکەی خۆی مایەوە کە لە بەردەرگای چوونە ژوورەوەی زاخەکە داندرابوو. کاتێک کچە هات و لە بەردەمیدا ڕاوەستا و ئەو تەبەڕوکی پێدا، سەرنجی وەک تووڵەمار بە سەر بەژنی لەباری کچەدا خوشی و ترسێکی خستە دڵیەوە. کچە بە بەردەمیدا تێپەڕی و ئەو هەستی کرد چزوویەک لە دڵی هەڵچەقی و مۆچڕکێکی بە سەرتاپایدا هێنا. دیتی ژنێکی چێژخواز و کاڵفامە. هەستا و چوو بۆ نێو حوجرەکەی. کچە لە سەر کورسیلەیەک دانیشتبوو و چاوەڕوانی ئەو بوو.

کاتێک پێی نایە نێو حوجرەکەوە، کچە هەستا سەر پێ.

گوتی: «دەمەوێ بچم بۆ لای باوکە گیانم!»

«مەترسە! کوێت دێشێ؟»

«هەموو گیانم!» ئەوەی گوت و دەموچاوی بە بزەیەکی شیرین ڕووون بۆوە.

باوەسێرگی گوتی: «خەمت نەبێ، هیچ ئازارێکت نامێنێ. دۆعا بکە!»

«چ کەڵکێکی هەیە! ئەو هەموو دۆعایەم کردووە. هیچ کەڵکێکی نەبووە!» هەروا بزەی لە سەر لێو بوو. «ئێستا ئێوە دۆعا بکەن و دەستتان بە سەرمدا بێنن. من ئێوەم لە خەونمدا دیتووە.»

«چۆن، لە کوێ بووم؟ چیم دەکرد؟»

«دیتم دەستتان لە سەر سنگم داناوە. ئاوا!» دەستی باوەسێرگیی گرت و لە سەر سنگی خۆی دانا و توند بە مەمکی نەرمی خۆیەوە گوشیی. «ئێرە!»

باوەسێرگی دەستی خۆی شل کرد و خستییە ئیختیاری کچەوە.

پرسیی: «ناوت چییە؟» سەرتاپای لەرزی و هەستی کرد دۆڕاوە و دێوی هەوەس زنجیری پساندبوو.

«ماریا! بۆ دەپرسی؟»

کچە دەستی باوەسێرگیی گرت و ماچی کرد، پاشان دەستێکی لە نێوقەدی وەرهێنا و خۆی پێوەگوشی.

باوەسێرگی گوتی: «چی دەکەی؟ ماریا، تۆ شەیتانی!»

«بەڵێ، ڕەنگە وابێ. مەگین چ دەبێ؟»

توند خۆی بە باوەسێرگییەوە گوشی و هەردوو دەستی لە نێوقەدی وەرهێنا و لە سەر تەختەکە لە پەنایدا دانیشت.

بەیانی باوەسێرگی لە زاخەکە هاتە دەرێ.

لە دڵی خۆیدا گوتی: «یانی ئەو بەدکاری و شوورەییە ڕاستەقینە بوو؟ ئێستا باوکی دێ و کچە هەموو شتێکی بۆ دەگێڕێتەوە. ئەو کچە شەیتانە. ئێستا چبکەم؟ ئاخ، ئەمە هەر ئەو بیورەیە کە من قامکی خۆمم پێ قرتاند.» هەڵیگرت و گەڕایەوە بۆ نێو حوجرەکە.

جانکوش دیتی و گوتی: «ئێزنگت دەوێ؟ تکایە بیورەکە بدە بە من.»



تەورەکەی دایە دەستی و چووە ژوورێ. کچە خەوی لێکەوتبوو. باوەسێرگی چاوێکی تەژی لە ترسی لێکرد. جلوبەرگی وەرزێڕیی هەڵگرت لەبەری کرد و قژی خۆی بە مقەست هەڵپاچی و بە تووڵەڕێیەکدا بەرەو لای ڕووبارەکە داگەڕا. بە قەراغ ڕووبارەکەدا ملی پێوەنا و هەتا کاتی نیوەڕۆ بەردەوام هەنگاوی نا و ڕانەوەستا. چووە نێو جاڕە جۆیەکەوە و لەوێدا ڕاکشا. دوای هێندێ پشوودان هەستا و وەڕێکەوتەوە و لای ئێوارێ گەیشتە گوندێکی قەراغ چۆمەکە، بەڵام نەچووە نێو دێ و بە هەڵەمووتێکی چڕی کەناری ڕووبارەکەدا هەڵزنا.

بەیانی زوو بوو، نیو سەعاتی مابوو بۆ خۆرهەڵات. هەموو شتێک بە خوناوە خووساو و وڵات خەمی لێدەباری و کزەبایەکی بەرەبەیان لە لای ڕۆژئاواوە دەهات. «دەبێ کۆتایی بەو کارە بهێنم. خودایەک لە گۆڕێدا نییە. بەڵام چۆنی کۆتایی پێ بهێنم؟ خۆم هەڵدێرم؟ بەڵام من مەلەوانم. ماسی خۆ لە ئاودا ناخنکێ. چۆنە خۆم هەڵواسم؟ بەڵێ، هەر بەو پشتێنە. خۆم بەو لقە دارەدا هەڵدەواسم!» ئەم ڕێگە چارەیە هێندە سانا و بەبێ لەمپەر بوو کە ترسی لێ نیشت. دەیویست بە جۆرەی خووخدەی خۆی لە کاتی هیوابڕاویدا دۆعا بکات. بەڵام پەنا بۆ کێ بەرێ؟ لە دۆعاکانیدا هانا بۆ کێ بەرێ؟ ئێتر بڕوای بە بوونی خودا نەبوو. دڵی بەتاڵ و هەتاڵ، کانیاوێکی وشکاوهاتوو! دانیشت، هەنیشکی کردە کۆڵەکە و لاڕوومەتی کردە سەر لەپی دەستی و لە نێو سەوزەڵانییەکەدا خۆی ڕاکێشا. لە ناکاو خەو چاوی پێ قورس

کرد و وەها بە سەریدا زاڵ بوو کە نەیتوانی سەری لە سەر لەپی دەستی ڕاگرێ. دەستی درێژ کرد و سەری کردە سەر قۆڵی خۆی و خەوی لێ کەوت. بەڵام خەوەکەی تەنیا ساتێکی خایاند. زوو خەبەری بۆوە. بە جۆرێک کە ئەوەی دەیدی نەیدەزانی بە خەو دەیبینێ یان بیرەوەرییەکە و دێتەوە یادی.

دیتی منداڵە، منداڵێکی ورد لە ماڵی دایکی لە گوندەکەی خۆیان، عارەبانەیەک هات و خاڵە نیکۆلای سێرگی یۆڤیچ بە ڕیشی درێژ و ڕەش و پانەوە کە دەتگوت خاکەنازە، دابەزی. لەگەڵ پاشنکا[۲۸] کە کچێکی لەڕ و لاواز بوو بە چاوانێکی مێهرەبان و ڕوخسارێکی شەرمن و بەستەزمانەوە. ئەو پاشنکایەشیان بەو وەسفانەوە هێنابوو بۆ نێو کۆڕی کوڕانی مێرمنداڵ و دەبوو ئەو کوڕانە یاریی لەگەڵ بکەن و سەرگەرمی بکەن کە ئەوەش زۆر کارێکی ناخۆش بوو، چونکە پاشنکا کچێکی چاو و گوێبەسراو بوو، ئاخری کاریان بە جێیەک گەیشت کە بیکەنە گاڵتەجاری خۆیان و داوایان لێ دەکرد کە نیشایان بدات چۆن مەلە دەکات، ئەویش لە سەر زەوی ڕادەکشا و لە سەر وشکانی دەست و لاقی ڕادەوەشاند و لاسایی مەلەی دەکردەوە، هەموو پێدەکەنین و تیتاڵییان پێدەکرد، پاشنکاش کە دەیزانی بۆتە ڕشقنجاڕی ئەو کوڕانە، پەڵەی سوور لە دەموچاویدا دەردەکەوتن و هێندەی هەست بە شەرمەزاری دەکرد، بەستەزمانانە سەری دادەخست کە ئەو دڵی پێی سووتا، ئەو ڕوخسارە فەقیرۆکە و بزە

١– Pachenka سووکەڵەناوی پراسکۆڤیا بۆ خۆشەویستی.



مێهرەبان و بێگەردەی پاشنکا کە لێوڕێژ بوو لە ملشۆڕ کردن و شەرمەزارییەکی منداڵانە وای لێکرد هەرگیز نەتوانێ لە بیری بچێتەوە. باوەسێرگی وەبیری هاتەوە کە دوای ئەو ڕۆژە ئیتر پاشنکای نەدیتبۆوە. ئەو دوای ماوەیەکی زۆر ئەو ڕۆژە پاشنکای دیتبوو، بەر لەوەی بچێتە ڕیزی تەرکەدنیاکانەوە. پاشنگا شووی کردبوو، مێردەکەشی مالیکێک بوو، هەموو سامانی ئەوی بە بادابوو و تۆسنانە لەگەڵی دەجووڵایەوە و لێی دەدا. پاشنکا دوو منداڵی هەبوو، کوڕێک و کچێک. بەڵام کوڕەکەی هەر بە منداڵی مردبوو. باوەسێرگی وەبیری دەهاتەوە کە پاشنکای بە چارەڕەشی دیتووە. پاشان ئەوی لە بارودۆخێکدا وەبیر هاتەوە کە مێردەکەی مردبوو و هاتبوو بۆ سەردانی من لە پەرستگە. لە چاو سەردەمی منداڵی زۆر نەگۆڕابوو. چاو و گوێبەستراو یان گەمژە نەبوو، بەڵام نە دڵڕفێنییەکی ژنانەی هەبوو و نە هەوەسبزوێن و سەرنجڕاکێش بوو، بەڵکوو لەبەر بێداروباری پیاو بەزەیی پێیدا دەهات. لەگەڵ کچەکەی و زاواکەی هاتبوو و کچەکەی و زاواکەشی دیار بوو دەستەنگ و هەژارن. پاشان بیستبووی کە ئەوان لە ناوەندی پارێزگایەک نیشتەجێ بوون و ژیانێکی زۆر تاڵ و دژواریان هەیە، لە دڵی خویدا گوتی: «ئێستا چبووە کە من ئاوا ئەوم وەبیر هاتۆتەوە؟» بەڵام چاری ناچار بوو و یادی پاشنکا لە مێشکی نەدەچووە دەرێ. «ئێستا ئەو لە کوێیە؟ بڵێی لە چ بارودۆخێکدا بێ؟ چۆن بژی؟ یانی هەروا هەژار و لێقەوماوە و وەکوو سەردەمی منداڵی ساویلکەیە کە لە سەر

عەرز خۆی ڕادەکێشا و مەلەی دەکرد؟ من بۆ ئاوا کەوتوومەتە بیر و خەیاڵی ئەو؟بەسە ئیترا دەبێ کارێک بکەم.»

دیسان ترسی لێ نیشت و دیسان بۆ خۆ دەرباز کردن لە دەست ئەو ترسە پەنای بۆ خەیاڵی پاشنکا بردەوە. ماوەیەکی زۆر بەو شێوەیە ڕاکشا و هێندێ جار بیری پاشنکا بۆ ئەو دەرووی ڕزگاری بوو. ئاخری خەوی لێکەوت و فریشتەیەک هاتە خەونی، لێی نزیک بۆوە و گوتی: «بڕۆ بۆ لای پاشنکا، ڕێگەچارەی خۆشت لە ئەو بپرسە! لە ئەو بپرسە کە تاوانت کامەیە و ڕێگای ڕزگاریت لە کوێوەیە؟»

لە خەو ڕاپەڕی. بە خۆی گوت کە ئەو خەونە پەیامێکە لە لایەن خوداوە. دڵی خۆش بوو و بڕیاری دا ئەوەی لە خەوەکەیدا پێی ئیلهام کراوە بیکات. دەیزانی پاشنکا لە چ شارێکە. هەتا ئەو شارەش دەبوو سێسەد وێرست ڕێگا ببڕێ. بەرەو ئەو شارە وەڕێکەوت.



## (٨)

پاشنکا ماوەیەک بوو ئیتر پاشنکایان پێ نەدەگوت، بەڵکوو پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا بوو، پیرێژنێکی ڕەقەڵە و چرچولۆچ و خەسووی فەرمانبەرێکی لە کار دەرکراو و گیرۆدە بە ئالکۆڵ، کە ناوی ماڤریکیف[29] بوو. لەو شارە دەژیا کە زاواکەی دوایین جار لەوێ فەرمانبەر بوو. لەگەڵ کچ و زاواکەی دەژیا و بژیودەری بنەماڵە بوو، کچەکەی و زاوا نەخۆش و گیرۆدەکەی بە کزیی ئەعساب و لە سەریەک حەوت سەر خێزانی بەخێو دەکرد، داهاتەکەی لە ڕێگای فێرکاریی مۆسیقاوە بوو کە کچانی بازرگان سەعاتی پەنجا کاپکیان پێ‌دەدا. ڕۆژی چوار پێنج سەعات کاری فێرکاریی دەکرد و مانگانە نزیکەی شەست ڕۆبڵی داهات هەبوو. بەم شێوەیە ژیانی کوڵەمەرگیی بەڕێوە دەهێنا و چاوەڕێ بوو کارێک بۆ زاواکەی پەیدا ببێ. پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا نامەی بۆ هەموو خزم و ئاشناکانی نووسیبوو، یەک لەوانە باوەسێرگی بوو، داوای لێ کردبوون کارێک بۆ زاواکەی بدۆزنەوە، بەڵام نامەکە کاتێک گەیشتە شوێنی مەبەست کە باوەسێرگی لەوێ نەمابوو.

ڕۆژی شەممە بوو و پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا خەریکی هەویر شێلان بوو کە شیرینی نقشک و کشمیش دروست بکات، لەو جۆرە

29- Mavrikyv

شیرینییەی کە ئەو کاتەی خۆی منداڵ بوو ئاشپەزەکەی باوکی دروستی دەکرد و زۆری پێ خۆش بوو. پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا دەیویست ڕۆژی دوایی دڵی نەوەکانی بەو شیرینییە شاد بێ و شیرینکامیان بکات.

ماشای کچی خەریک بوو شیری بە منداڵە بەرمەمکانەکەی دەدا و دوو منداڵەکەی تریشی کە گەورەتر بوون کچێک و کوڕێک لە قوتابخانە بوون. زاواکەی کە شەوانە نەدەخەوت ئێستا لە حەوسالان ڕاست بووبۆوە. پراسکۆڤیا میخاییلۆڤناش شەوی ڕابردوو ماوەیەکی زۆر بەخەبەر مابۆوە و هەوڵی دابوو کچەکەی خاو بکاتەوە کە ڕقی لە مێردکەی هەستابوو و وەک هەور دەیگرماند.

دەیدی زاواکەی پیاوێکی خوێڕی و کەمغیرەتە و لەبەر دەستەوستانی هیچ کارێکی پێ نەدەکرا. دەیدی کە لۆمە و سەرکۆنەی کچەکەی هیچ کەڵکێکی نییە و بە هەموو توانایەوە تێدەکۆشا ئارامی بکاتەوە و ژەنگوژاری ڕق و تووڕەیی لە سیمای ماڵەکەی بسڕێتەوە و پرشنگی شادیی تێبگێڕێ. دەکرێ بڵێین بە ڕۆح و گیان دژی شەڕ و قڕە بوو و نەیدەتوانی پێوەندیی دژبەرانە و کێشەی نێوان خەڵک تامڵ بکات. بە ڕوونی دەیدی کە ڕق و تووڕەیی هیچ کێشە و ئاریشەیەک چارەسەر ناکا، بەڵکوو هەموو کارەکانیش دژوارتر دەکات. ئەو تەنانەت لەو بارەوە هەر بیریشی نەدەکردەوە. کاتێک شەڕوقڕە و ڕق هەستانی دەدی وەها پێی تێکدەچوو دەتگوت بۆگەنی لاشەی بە سەردا دێ یان دەنگێکی گوێئازار دەبیستێ یان



زەبری مشتێک لە دەموچاوی دەکەوێ، بۆیە خەم دڵی دادەگرت و گرژ دەبوو.

خۆشحاڵ بوو کە چۆنیەتیی شێلانی هەویری ئەم شیرینیەی فێری لووکریا[30] کردووە. لەو کاتەدا میشا نەوە شەش ساڵانەکەی بە بەروانکە و پانتۆڵی پیناوی و لاقوقولی خواروخێچەوە بە هەڵاتن خۆی کرد بە چێشتخانەکەدا و ترساوانە گوتی: «دایە گەورە، پیرەپیاوێک هاتووە کاری بە تۆیە. زۆر سەیرە، پیاو لێی دەترسێ!»

لووکریا چاوێکی لە دەرێ کرد و گوتی: «سواڵکەرێکە. داوای خێر دەکات، دایەگەورە!»

پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا دەستە ڕەقەڵ و کزەکانی لە یەک ساوی و پاشماوەی هەویرەکەی لێ هەڵپریواند و ویستی کاپێکێک بدات بە پیرەپیاوەکە. بەڵام وەبیری هاتەوە سکەی چکۆلەتر لە دە کاپکیی پێ نییە و بڕیاری دا چاوپۆشی لە پێدانی پارە بکات و بە هێندێ نان پیرەپیاو لە کۆڵ خۆی بکاتەوە و بە پەلە گەڕایەوە بۆ نێو چێشتخانەکە. بەڵام لەو چنۆکییەی خۆی شەرمەزار بۆوە و سوور هەڵگەڕا، بە لووکریای گوت نانێکی بۆ بەرێ، خۆشی چوو سکەیەکی دە کاپکی بێنێ و بیداتێ، لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەمەش سزای نینۆکوشکی! دەبێ ئەمیش بدەی و ئەویش!»

بە داوای لێبووردنەوە نان و سکەکەی دا بە کابرای دەرۆزەکەر و نەک بەو بەخشینەی خۆی بایی نەبوو، بەڵکوو بە پێچەوانە

30- Loukerya

شەرمەزاریش بوو کە دەستی خاڵییە و ناتوانێ لەوە زیاتری بداتێ و لە هەمبەر سام و هەیبەتی کابرای خوازەڵۆکدا تریق بۆوە.

ئەگەرچی کابرای سواڵکەر سێسەد وێرستی ڕێگا بڕیبوو و بە ناوی مەسیح سواڵی دەکرد، ئەگەرچی جلوبەرگێکی شڕۆڵی لە بەردا بوو و خۆشی تەنیا کۆمەڵێ پێست و ئێسقان بوو، ئەگەرچی برسی و تینوو بوو، قژی درێژی خۆی هەڵپاچیبوو و کڵاوێکی مووژیکانەی لە سەر نابوو و جزمەکانی لە پێی دادەکەوت، ئەگەرچی زۆر بە زەبوونی لە بەردەمیدا کڕنۆشی برد، بەڵام لە هەیبەتی ڕابردووی کە هەموو سەرنجێکی بۆلای خۆی ڕادەکێشا هیچ کەم نەبووبۆوە. بەڵام پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا ئەوی نەناسییەوە. چۆن دەیتوانی بیناسێتەوە. سی ساڵ بوو چاوی پێی نەکەوتبوو.

«ببوورە، باوکەکەم! ڕەنگە زۆرت برسی بێ!»

باوەسێرگی نان و پارەکەی وەرگرت. بەڵام پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا واقی ورما چونکە دیتی پیرەپیاو لە جێی خۆی ڕاوەستاوە و تێیڕاماوە.

«پاشنکا، من پەنام بۆ تۆ هێناوە، تکایە دەستم بە ڕووەوە مەنێ!»

چاوە ڕەش و سەرنجڕاکێشەکانی، کە لێوڕێژ بوون لە داوا و پاڕانەوە، هەروا لە سەر چاوی پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا گیرسابۆوە و فرمێسکی قەتیسماوی سەر بیبیلەی چاوی بریقەی دەهات. لێوی لە ژێر سمێڵە سپییەکەیدا وەها دەلەرزی کە بەزەیی پێدا دەهاتەوە.



پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا چنگی لە بەرۆکی خۆی گیرد کرد، دەمی داچەقاند و چاوە پڕ لە واقوڕمانەکەی لە کابرای دەرۆزەکەر بڕیبوو و لە جێی خۆی وشک بوو.

«باوەڕ ناکەم، ستیڤا[٣١] سێرگی، باوەسێرگی!»

باوەسێرگی لەسەرەخۆ گوتی: «بۆ باوەڕ ناکەی، باوەڕ بکە. بەڵام ئیتر سێرگی یان باوەسێرگی نیم. ستێپان کاساتسکیم. تاوانبارێکی دڵڕەش، دڵڕەش! تکایە دەستم بە ڕووەوە مەنێ و یارمەتیم بدە!»

«نا، چۆن شتی وا دەبێ؟ بۆ خۆت ئاوا زەبوون دەکەی و سووکایەتی بە خۆت ڕەوا دەبینی؟ بۆ نایەیتە ژووری؟»

پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا دەستی بردە پێشێ بەڵام باوەسێرگی دەستی ئەوی نەگرت و بە دوایدا چووە ژووری.

ئەو ژنە بێچارەیە دامابوو کە میوانەکەی بباتە کوێ؟ ماڵەکە زۆر چکۆلە بوو. وەتاغێکی چکۆلە لە پێشەوە و دەکرێ بڵێین سندووقخانەیەکیان پێدا بوو. بەڵام دواتر بە ناچاری ئەو سندووقخانەیەشی دابۆوە بە کچەکەی و ئێستا ماشا لەوێ دانیشتبوو و منداڵە بەرمەمکانەکەی لە باوەش گرتبوو و ڕایدەژاند کە خەوی لێ بکەوێ.

کورسیلەیەکی لە چێشتخانەکە پێشان باوەسێرگی دا و گوتی: «جارێ لێرە دانیشە هەتا دوایی!»

---

١- سووکەڵەناوی خۆمانەی ستێپان.

باوەسێرگی خێرا دانیشت، دیار بوو بە پێی خووخدە، هەگبەکەی سەرەتا لە شانێکی و پاشان لە شانەکەی دیکەی داماڵی.

«وەی خودایە گیان! ئەم زەبوونییە لە کوێوە هات؟ باوکەکەم، چ مەزنایەتییەک و لە ناکاویش ئاوا زەبوونی!...»

باوەسێرگی وەڵامی نەدایەوە و تەنیا بزەیەکی دڵۆڤانانە نیشتە سەر لێوی و هەگبەکەی لە پەنا خۆیەوە دانا.

پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا چوو بۆ لای کچەکەی و گوتی: «ماشا، تۆ دەزانی ئەوە کێیە؟»

بە سرتە کچەکەی تێگەیاند کە باوەسێرگی کێیە و بە یارمەتیی یەکتر لانکە و جێوبان و کەلوپەلەکانیان لەو ژوورە چکۆلەیە بردە دەرێ و بۆ باوەسێرگییان خاڵی کرد.

پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا باوەسێرگیی برد بۆ ژوورەکە.

«فەرموو. لێرە پشوو بدە. لێم زویر مەبە کە بە تەنیا جێتان دەهێڵم. دەبێ بڕۆم!»

«دەچی بۆ کوێ؟»

«وانەم هەیە. هۆی شەرمەزارییە. بەڵام چبکەم؟ وانەی مۆسیقا دەڵێمەوە.»

«مۆسیقا! زۆر باشە! بەڵام شتێک.... پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا، من ئیشم بە تۆیە. کەنگێ دەتوانم هێندێک لەگەڵتان بدوێم؟»

«لەگەڵ من بدوێی؟ بۆ من هۆی شەرمەزارییە! چ شانازییەک! ئەمشەو باشە؟»



«بەڵێ، زۆر باشە. تکایەکیشم لێت هەیە. سەبارەت بە من لەگەڵ هیچ کەس قسە مەکە. نابێ هیچ کەس بزانێ من لێرەم. تەنیا تۆی لە ڕازی من ئاگاداری. هیچ کەس نازانێ من لە کوێم. من دەبێ خۆم بشارمەوەو.»

«ئەیەڕۆ. بەڵام من بە کچەکەمم گوت.»

«باشە پێی بڵێ با ئەویش لە لای هیچ کەس دەنگ نەکات.»

باوەسێرگی چەکمەکانی لە پێ داکەند و لە ژوورەکەدا خۆی لە گەزدا و لەڕێوە خەوی لێکەوت. چونکە شەوی ڕابردوو نەخەوتبوو و چل وێرستی ڕێگا بڕیبوو.

کاتێک پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا گەڕایەوە، باوەسێرگی لە ژوورە چکۆلەکە چاوەڕوان دانیشتبوو. بۆ فراوێن لە ژوورەکە نەهاتە دەرێ و سووپ و شۆرباوی گەنمەڕەشە، کە لووکر بۆی هێنا هەر لەوێ خواردی.

باوەسێرگی لە پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنای پرسی: «بۆ زووتر لەوەی گوتت گەڕایەوە؟ ئێستا دەتوانین قسە بکەین؟»

«دەتەوێ پێت بڵێم چ بووە؟ بەختەوەری ڕووی تێکردووم و میوانێکی ئاوا خۆشەویست بە سەری کردوومەوە! وانەیەکم بەجێهێشت. پاشان... دڵم هەر لە لای تۆ بوو، دەمویست زوو بگەڕێمەوە خزمەتت. باوە، من دەمویست بێم بۆ سەردانی ئێوە. نامەیەکیشم نووسی و ئێستا ئەو شانازییەم بە نسیب بووە و ئێوە هاتون بۆ ئێرە.»

«پاشنکا، ئەو قسانەی لە لای تۆ دەریدەبڕم، وەک دانپیانانی تاوانبارێک لێی بڕوانە. ئەمانە قسەیەکن کە دەبێ من لە کاتی مەرگدا بە خودای بڵێم. پاشنکا، من مرۆڤێکی پیرۆز نیم. تەنانەت مرۆڤێکی ئاسایی و تاوانبارێکی وەک خەڵک ئاساییش نیم. من تاوانبارێکی دڵڕەشم، چەپەڵ، قێزەون، گومڕا. تاوانبارێکی خۆپەرست و لەوانەش خراپتر! نازانم ئەگەر لە تەواوی خەڵک خراپتر نەبم، لە زۆربەی خراپکارە گەورەکان بێڕەوشتتر و ناپاکترم.»

پاشنکا سەرەتا چاوی زەق کردبۆوە و تێیڕامابوو. بەڵام بڕوای بە قسەکانی نەدەکرد. پاشان کاتێک باوەڕی تەواوی بە قسەکانی کرد، دەستی لە سەر دەستی باوەسێرگی دانا و بە چاوێکی پڕ بەزەییەوە تێیڕوانی و گوتی:

«ستیڤا[٣٢]، تۆ دڵنیای زێدەڕۆیی ناکەی؟»

«نا، پاشنکا، من سۆتە و داوێنپیس و مرۆڤکوژ و ناپاک و فێڵبازم.»

پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا گوتی: «وەی خودایە، ئەوە چ قسەیەکە تۆ دەیکەی!»

«چبکەم، ژیانە. منێک کە پێم وابوو هەموو شتێک دەزانم ڕێگای ژیانم پیشان خەڵکی دەدا، تێگەیشتووم هیچ نازانم و تکا لە تۆ دەکەم فێرم بکەی!»

١- سووکەڵەناوی ستیپان بۆ خۆشەویستی.



«تۆ چی دەڵێی ستیڤا؟ گاڵتە دەکەی. ئاخر ئێوە بۆ هەمیشە من دەکەنە گاڵتەجاڕی خۆتان؟»

«باشە، وای دانێین من گاڵتە دەکەم. تۆ تەنیا بۆ من باس بکە چۆن دەژی و تا ئێستا چۆن ژیاوی؟»

«من؟ هیچ کەس ژیانی لە ژیانی من ڕەشتر و بێماناتری نەدیوە. ئەم ژیانە ڕەشەی بۆتە بەشم سزای ڕابردووە.»

«چۆنت شوو کرد؟ ژیان لەگەڵ مێردەکەت چۆن بوو؟»

«هەمووی تاڵ؛ شووم کرد. ئاشق بووم بەڵام نازانی چەندە پیس و ناحەز! باوکم دژی ئەو شووکردنەم بوو. کوڕەی بە دڵ نەبوو. بەڵام من شێت بووم. قسەی هیچ کەسم بە گوێدا نەدەچوو، هەردوو پێم لە کەوشێک کردبوو، دەمگوت هەر شووی پێدەکەم. بەڵام کاتێک زەماوەندم کرد بە جێی ئەوەی یارمەتیی مێردەکەم بدەم و دڵخۆشی بکەم بە ئێرەیی و دڵپیسی ئازارم دەدا. ئەوەش بەڵایەک بوو لە دڵمدا کە نەمدەتوانی بە سەریدا زاڵ بم.»

«بیستوومە مێردەکەت گیرۆدەی مەشرووب بوو.»

«بەڵێ، ئاخر من هێمنایەتیم بۆ نەهێشتبۆوە. بەردەوام لۆمەم دەکرد، بەڵام چارە نییە ئەو گیرۆدە بوونە جۆرێک نەخۆشییە. نەیدەتوانی بەر بە خۆی بگرێ، من ئێستا دێتەوە بیرم کە نەمدەهێشت ساتێک بە ئاسوودەیی سەر بکاتە سەر سەرین و خواردنەوەکەم لێ دەکردە ژەهری مار. وەهاش بە گژیدا دەهاتم و ئازارم دەدا مەگین خودا خۆی بزانێ.»

چاوە جوانەکانی بە هێنانەوە بیری ئەو بیرەوەرییانە بوونە دەریای ئازار و لە کاساتسکیی دەڕوانی.

کاساتسکی وەبیری هاتەوە کە بیستبووی مێردەکەی لێی دەدا. ئێستا ملی ڕەقەڵەی پاشنکای بەو دەمارە بەرجەستانەی پەنا گوێی و قژی تەنک و نیوەسپی و نیوە خورماییەوە دەدی و وەک ئەوە وا بوو کە ئەو دیمەنەی لە بەرچاو بێ.

«ئەو کاتە بە دەستی خاڵی و دوو منداڵی سەروپێچکەوە بە تەنیا مامەوە.»

«چۆن بە دەستی خاڵی! ئەی ملکەکەتان چیی لێ هات؟»

«ڤاسیا[٣٣] هێشتا نەمردبوو کە هەموویمان فرۆشت و.. ئاخر دەبوو بژیین و من وەکوو هەموو نازپەروەردەکانی هاوشێوەی خوم توانایی هیچ کارێکم نەبوو، دەستوپێ سپیلکە و دەستەوستان بووم. داماو و لێقەوماو، لە هەموو کەس خوێڕیتر و لەشگرانتر. ئەوەی هەمبوو گەسکی لێدرا. ناچار خوم دەرسم بە منداڵەکانم دەگوت و لەو ڕێگایەوە شتێک فێر بووم. لە ناکاو میتیا[٣٤] نەخۆش کەوت. پۆلی چوارەم بوو، مرد و جەرگی بە کوچکەوە دام. ماچنکا[٣٥] کە گەورەتر بوو ئاشقی ڤانیا بوو کە ئێستا زاوامە. کوڕێکی باشە بەڵام بۆ بەدبەختی نەخۆشە.

---

١- ڤاسیا سووکەڵەناوی ڤاسیلی.
٢- سووکەڵەناوی دیمیتری
٣- ماچنکا و ماشنکا هەردووکیان سووکەڵەناوی ماریان.



کچەکەی بانگی کرد: «دایە گیان! میشا بانگ کە بۆ لای خوت، من ناتوانم هەردووکیان بحاوێنمەوە.»

پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا هەستا سەر پێ. بە پەلە کەوشە پاژنە سواوەکانی لە پێ کرد و لە ژوورەکە چووە دەرێ. بە پەلە منداڵێکی دوو ساڵان لە باوەشدا گەڕایەوە و منداڵەکە خۆی بە پشتدا دەخست و بە دەستە خرپنەکانی لەچکەکەی دایەگەورەی گرتبوو دەیکێشا.

«چیمان گوت، بەڵێ، کەسپێکی باشی هەبوو، بەرپرسەکەشی مرۆڤێکی مێهرەبان بوو. بەڵام ڤانیا تاقەتی نەهێنا و وازی لە کەسپەکەی هێنا.»

«نەخۆشییەکەی چییە؟»

«لاوازیی ئەعساب! نەخۆشییەکی ترسناکە. زۆرمان حەول داوە بۆ ماریجەی. هەموو دەڵێن دەبێ سەفەر بکات. گۆڕینی ئاو و هەوا! بەڵام خۆ ئەوە بۆ ئێمە ناگونجێ. من بەردەوام دۆعا دەکەم و هیوادارم خۆی چاک بێتەوە. خو نەخۆشییەکی تایبەتی نییە. بەڵام....»

دەنگی زاواکەی کە ڕەگەی لەشگرانی و بێتاقەتیی پێوە دیار بوو لەو دیوەوە بەرز بۆوە: «لووکریا! ڕاست لەو کاتەدا کە پیاو کاری پێیەتی دەینێرن بەملا و ئەولادا.»

دیسان پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا قسەکەی خۆی بڕی: «ئێستا دێ! هێشتا نانی نیوەڕۆی نەخواردووە. ئاخر خو لەگەڵ ئێمە نان ناخوا.»

چوو نانی بۆ زاواکەی دانا و لەگەڵ ئەوەی دەستە کز و ڕەشهەڵگەڕاوەکانی وشک دەکردەوە گەڕایەوە.

«بەڵێ، ئێمە ئاوا دەژیین و بەردەوام سکاڵامان لە دەست ئەو ژیانە هەیە. بەڵام قەیناکا. شوکر بۆ خودا نەوەکانم ساغ و سڵامەتن و هێشتا دەتوانین سەری خۆمان ڕاگرین. بەڵام بۆ باسی من بکەین؟ چ شتێکی سەرنجڕاکێش لە ژیانی مندا هەیە؟»

«دەی، لە چ ڕێگایەکەوە ژیانی خۆتان بەڕێوە دێنن؟»

«من هێندێک کار دەکەم. مۆسیقایەک کە بە هەزار حاڵ فێری بووم ئێستا بەکەڵکم دێ.» قامکە باریک و شووشەکانی لە سەر دۆلابی چکۆڵەی پەنا خۆی دانا، وەک ئەوەی بە سەر جگی پیانۆیدا بهێنێ، جووڵاندییەوە.

«بۆ هەقدەستی ئەو کارەت چەندەت دەدەنێ؟»

«هێندێ کەس سەعاتی ڕۆبڵێک، هێندێکیش پەنجا کۆپک و هی واش هەیە تەنانەت سی کاپکی بە زۆر لە چنگ دەردێ. هەموویان بە چاوی ڕێزەوە لێم دەڕوانن و زۆر لەگەڵما مێهرەبانن.»

کاساتسکی بە زەردەخەنەیەکەوە پرسیی: «دەی باشە، هیچ پێشکەوتنێک هەیە لە کارەکانیاندا؟»

پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا سەرەتا باوەڕی نەدەکرد کە پرسیارەکەی ئەو جیددییە و سەرنجە پڕ پرسیارەکەی لە چاوی کاساتسکی بڕی.

«بەڵێ، هێندێکیان پێشکەوتیان هەیە. بۆ وێنە یەکیان کچی قەسابێکە. زۆر قوتابییەکی باشە. زۆر دڵنەرمە و لە سەر کارەکەی خۆی سوورە. بۆ وێنە ئەگەر من ژنێکی لێزان بوایەم لە ڕێگای دۆست و ئاشناکانی باوکی ئەو قوتابییەوە کارێکم بۆ زاواکەم



دەدۆزییەوە. بەڵام نا، من هیچ کارێکم لە دەست نایە و ئەو منداڵە بەستەزمانانەم تووشی ئەو چارەڕەشییە کردووە.»

کاساتسکی سەری داخست و گوتی: «بەڵێ، بەڵێ، تێدەگەم!» پاشان پرسیی: «ئێستا پێم بڵێ بزانم پاشنکا، پێوەندیتان لەگەڵ کلێسە چۆنە؟»

«ئاخ، باسی کلیسا مەکە! هێندە بێئیرادەم بە جارێ وازم لە کاروباری کلیسا هێناوە. لەگەڵ منداڵەکان دۆعا دەخوێنم.  هێندێ جار دەچم بۆکلێسە. بەڵام برێ جار چەند مانگی پێدەچێ و سەر بە کلێسەدا ناکەم. منداڵەکان دەنێرم.»

«بۆچی خۆت ناچی؟»

تۆزێ سوور هەڵگەڕا و گوتی: «ڕاستت دەوێ هەست بە شەرمەزاری دەکەم. بەو جلوبەرگە شڕ و کۆنانەوە چۆن لەگەڵ کچ و نەوەکانم بچمە نێو خەڵک؟ خۆ پارەشم نییە جلوبەرگی تازەی پێ بکڕم. جگە لەوە زۆریش تەوەزەل و لەشگرانم.»

«دەی باشە، لە ماڵەوە دۆعا دەخوێنی؟»

«بەڵێ، لە ماڵەوە دەیخوێنم. بەڵام چ دۆعایەک! هەر دەڵێی قورمیش کراوم. دەزانم بەو چەشنە دۆعا خوێندن باش نییە. بەڵام چبکەم بیرم ئاڵۆزە و ئیمانی ڕاستەقینەش لە دڵما نییە. تەنیا شتێک کە ڕوون و ئاشکرایە ئەم چارەڕەشییەیە و بەس.»

کاساتسکی وەک ئەوەی قسەکانی پاشنکا پشتڕاست بکاتەوە، گوتی: «بەڵێ، بەڵێ، هەروایە....»

لەو کاتەدا دیسان زاواکەی پاشنکا دەنگی گڕ و تووڕەی بەرز کردەوە.

پاشنکا لە وەڵامی زاواکەیدا گوتی: «ئێستا، ئێستا دێم.» بە پەلە لەچکەکەی سەری ڕاستەوپاستە کرد و لە ژوورە چکۆلەکە چووە دەرێ.

ئەمجارەیان ماوەیەکی زۆر لە دەرێ مایەوە. کاتێک هاتەوە ژوورێ، کاساتسکی هەر بەو جۆرە دانیشتبوو کە ماوەیەک لەمەوبەر بەجێیهێشتبوو. دانیشتبوو، هەردوو بەلەمرکی لە سەر ئەژنۆی دانابوو و چەناگەی نابووە لە سەر لەپی هەردوو دەستی و سەری داخستبوو. بەڵام ئەمجارەیان هەگبەکەی لە کۆڵ کردبوو.

کاتێک بە چرا لامپایەکەوە هاتە ژوورێ، کاساتسکی سەری بەرز کردەوە و بە چاوانی جوان و زۆر ماندوویەوە لە پاشنکای ڕوانی و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

پراسکۆڤیا میخاییلۆڤنا شەرمنانە گوتی: «من پێم نەگوتن کە ئێوە کێن. تەنیا گوتم پیاوێکی هەژاری دەرۆزەکەرە و لە بنەماڵەیەکی خانەدانە و ئاشنای قەدیمیمانە. با بچین بۆ ژووری نان خواردن لەوێ چاییەک بخۆوە.»

«نا...»

«باشە، چاییەکەت بۆ دێنم بۆ ئێرە!»

«نا، پێویست ناکا. خودا ڕزگارت بکا، پاشنکا! من دەڕۆم. ئەگەر دڵت پێم دەسووتێ بە هیچ کەس مەڵێ منت دیتووە. تۆ ئەو خودایەی



زیندووە و ئاگاداری ئێمەیە بە هیچ کەس مەڵێ. زۆرت سپاس دەکەم. لەبەر خاتری مەسیح بمبوورە و گەردنم ئازاد کە!»

«متفەڕکم بدەیە باوە.»

«خودا متفەڕکت بداتێ. بمبوورە کە ئەوەم لە دەست نایە.»

دەیویست بڕوا بەڵام پاشنکا نەیهێشت. خێرا چوو نان و غوراپی و نقشکی بۆ هێنا. کاساتسکی هەمووی وەرگرت و ڕۆیشت.

هەوا تاریک بووبوو. هێشتا دە هەنگاو دوور نەکەوتبۆوە کە ئیتر نەدەبیندرا و تەنیا بە وەڕینی سەگی ماڵی قەشەدا بۆی دەرکەوت کە لە بەرماڵی ئەوانەوە تێپەڕیوە.

«کەوایە ئەوە بوو مانای خەوەکەی من. پاشنا بۆ من سەرمەشقێکی باش بوو. بەڵام من بە ڕێگای ئەودا نەڕۆیشتم. خودا و خزمەت کردن بە ئەوم کردە بیانوو و چاوم لە خەڵک بوو. پاشنکا بۆ خودا دەژی، بەو خەیاڵەی کە لە بەر خەڵک زیندووە. بەڵێ، کارێکی باش، پیاڵە ئاوێک کە بەبێ تەماح و پاداش دەدرێ بە تینوویەک، زۆر پڕبایەخترە لە هەموو ئەو کارە باشانەی کە من لە ڕێگای خەڵکدا کردوومە.» لە خۆی پرسی: «یانی بەڕاستی ڕێزەیەک خواستی سادقانە دەرهەق بە خودا لە دڵی مندا هەبوو؟» وەڵامەکەشی ئەمە بوو: «بەڵێ، هەبوو، بەڵام هەمووی بە هەرزەگیای ناوبانگخوازی و هەوەسی ناو لە چاوی خەڵکدا داپۆشراو و ڕمووده بووبوو. بەڵێ، بۆ کەسێک کە وەک من بۆ دەستەبەر کردنی ناو لە بەرچاوی خەڵک

ژیاوە، خودا بوونی نییە. من لەمە بە دواوە بۆ دۆزینەوەی خودا هەوڵ دەدەم و دەست دەکەم بە گەڕان.»

وەڕێکەوت. هەروەک چۆن هاتبوو بۆ لای پاشنکا، ئاوا درێژەی بە گەڕان دا و لەم گوندەوە بۆ ئەو گوند دەچوو. لەگەڵ پارسەکی تر، جا ژن بوایەن یان پیاو، یەک دەکەوت و دێ بە دێ دەسووڕانەوە، سواڵی نانی دەکرد و قوژبنێکی دەویست کە شەوێ تێدا ڕۆژ بکاتەوە و مەسیحی دەکردە تکاکار. هێندێ جار خاتوونێکی زمانتاڵ تەشەر و توانجی پێدا دەدا و بە دژوێن دەیتەزاند و لەبەر دەرگاکەیان ڕاوەی‌دەنا و بە مەست و بەڕەڵڵای ناو دەبرد، بەڵام زۆربەی خەڵک نان و ئاویان پێ‌دەدا و تێریان دەکرد، تەنانەت دراوێکیان دەخستە قاپەکەیەوە. توانایی و دەسەڵات و هەیبەتی ئەربابانەی هەستی خێرخوازیی دەخستە دڵی هێندێ کەسەوە، بەڵام برێ کەس شایی لە دڵیان دەگەڕا کە دەیاندی ئەربابێک ئاوا تووشی داماوی و لێقەوماوی بووە و کەوتۆتە سواڵ. بەڵام نەرمی و لەسەرەخۆیی و ئاکاری خاکەڕایانەی شوێنی لە سەر دڵی زۆربەی خەڵک دادەنا.

هەرجارێک کە لە ماڵی خێرخوازێکی خانەخوێی ئینجیلێکی دەدی، دەستی دەدایە و بە دەنگی بەرز دەیخوێندەوە و هەمیشە لە هەموو شوێنێک ئۆخژنی دەخستە دڵەکانەوە و هەمووانی تووشی سەرسووڕمان دەکرد کە وتەیەکی نوێ دەبیستن، بەڵام لە مێژ بوو بە گوێیان ئاشنا بوو و دڵیان بە هەوا خۆشەکەی دەسپارد.



ئەگەر بیتوانیبایە خزمەتێک بە خەڵک بکات یان بە ڕێنوێنی گرفتێکیان بۆ چارەسەر بکات یان کێشە و ئاژاوەیەک داکوژێنێ و دەنگ داگۆڕیوان لەگەڵ یەک ئاشت بکاتەوە، قەت سپاسی لێ نەدەکرا چونەکە لە شوێنێک نەدەمایەوە و گەڕۆک و ماندوو گونداوگوندی دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا وردە وردە خودا لە ناخیدا خۆیا دەبوو.

جارێک لەگەڵ دوو پیرێژن و سەربازێک بووە هاوڕێ. پیاوێک و ژنێک کە سواری فایتوونێک بووبوون و دوو ئەسپی تیژڕۆی تێکرابوو، ژن و پیاوێکی تریش بە سواری ئەسپ شان بە شانی فایتوونەکە دەڕۆیشتن، کە تووشیان بوون ڕایانگرت. مێردی خاتوون و کچەکەی سواری ئەسپ بووبوون و خاتوون لەگەڵ مسافیرێکی فەڕەنسی لە نێو فایتوونەکەدا شان بە شانی یەک دانیشتبوون.

ئەوان باوەسێرگی و هاوڕێکانی ئەویان ڕاگرت تاکوو Pelerins بیابانگەڕ پیشانی میوانەکانیان بدەن. «ئەو زیارەتکەرانەی کە بە پێی باوەڕی پڕوپووچی تایبەتی ڕووسەکان لە بیابانەکاندا سەرگەردانن و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنیکی تر دەڕۆن.»

ئەوان بە زمانی فەڕەنسی قسەیان دەکرد و پێیان وا بوو هیچ کەس لە قسەکانیان تێ‌ناگا.

کابرای فەڕەنسی گوتی:

“Demandes, leur s’ilssont bien surs de que peleringe est agreeable a’Dieu.[36]”

36. فەڕەنسییە، یانی لێیان بپرسن کە دڵنیان خودا لەو سەفەرە زیارەتییەی ئەوان ڕازییە.

ئەوان پرسیاریان دەکرد و پیرێژنەکان وەڵامیان دەدایەوە: «ئەگەر خودا قەبووڵی بکات. هێشتا هێزی لاقمان ماوە، بەڵام ئەوەی کە دڵەکانمان لەگەڵیانە یان نا، خودا خۆی دەزانێ!»

هەر ئەو پرسیارەیان لە سەربازەکە کرد، سەربازەکە گوتی تەنیا و بێماڵ و حاڵە و هیچ کوێی نییە بچێ.

لە کاساتسکییان پرسی کێیە. گوتی: «بەندەیەکی خودا!»

"Qu'est-ce qu'il dit? Il ne repondpas."[37]

"Il dit qu'ilest un serviteur de Di'eu."[38]

"cela dait etre un fils de pretre. Il ade larace avez- vous de la monnaie?"[39]

کابرای فەڕەنسی دراوی وردەی پێ بوو هەر کەسەی بیست کاپکی پێ دان.

"Mais dites lew que ce n'est pas pour les cireges que le leur donne, mais pour qu'ils serogaleut duthe'."[40]

بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: «بۆ چایی، چایی!» پاشان دەستی بە دەستەوانە داپۆشراوی لە شانی کاساتسکی دا و گوتی: « Monvieux pour rous»[٤١]

١- فەڕەنسییە، یانی چی دەڵێ؟ وەڵام ناداتەوە؟
٢- فەڕەنسییە، یانی دەڵێ بەندەیەکی خودایە.
٣- فەڕەنسییە. یانی ئەو دەبێ قەشەزادە بێ. دیارە نەجیم و خانەدانە.
٤- فەڕەنسییە. یانی بە ئەوان بڵێن کە ئەو پارەیە بۆ مۆم نییە، بۆ ئەوەیە ئەوەندە پێیان خۆشە چایی بخۆنەوە.
٥- فەڕەنسییە. یانی بۆ ئێوەیە، هاوڕێ!



کاساتسکی کە کڵاوەکەی لە سەر نەنابوو، سەری ڕووتی دانەواند و گوتی: «مەسیح ئاگادارتان بێ.»

کاساتسکی زۆری ئەو دیدارە بە دڵ بوو چونکە گوێی بە بیر و باوەڕی خەڵک نەدەبزوا سەبارەت بە خۆی، سادەترین و ساناترین کاری کرد کە لە دەستی دەهات و بیست کاپکەکەی بەوپەڕی خاکەڕاییەوە وەرگرت و دای بە پارسەکێکی ڕووناکدڵ. هەتا کەمتری گرنگی بە بیر و باوەڕی خەڵک دەدا، بوونی خودای لە ناخی خۆیدا بەهێزتر هەست پێدەکرد.

هەشت مانگ بەو شێوە بە بیابانگەڕی ڕایبوارد. مانگی نۆهەم لە ناوەندی پارێزگایەک، لە پەناگایەکدا کە شەوی لەگەڵ زیارەتکەران ڕۆژ کردبۆوە، دەستبەسەریان کرد، چونکە پەساپۆرتی نەبوو و بە قۆڵبەست کراوی بردیان بۆ ئاسایش. لەوێ لێیان پرسی پێناسەکەی کوا و ناوی چییە. گوتی پێناسەی نییە و بەندەیەکی خودایە. ئەویان بە تاوانی هەڵەگەڕی حوکم دا و دووریان خستەوە بۆ سیبری.

لە سیبری وەکوو کرێکارێک لە لای وەرزێرێکی ساماندار نرایە بەر کار و ئێستاش هەر لەوێیە. لە باخی میوەی وەرزێرەکەدا کاری دەکات و دەرسی بە منداڵی ئەربابەکەی دەڵێ و پەرستاری لە نەخۆش و لەشبەباران دەکات.

## فەرهەنگۆک

**ئاریشە:** کێشە، گرفت و ئاڕۆری دژوار و نالەبار.

**ئۆخژن:** دڵحەسانەوە، ئۆقرە گرتن.

**بەلەمرک:** هەنیشک، ئانیشک (آرنج)

**بەردیلە:** فوسیل (سنگوارە)

**پارسەک:** سواڵکەر، خازەڵۆک، دەرۆزەکەر

**پێسیر:** بەرۆک، یەخە، بەروێ

**پەرجۆ:** مۆجرات

**تەوەزەل:** لەشگران، قوونقورس، تەمبەڵ.

**تەوسەبزە:** بزەی مانادار و تەشەراوی (ریشخند)

**جەرگ بە کوچکەوە دان:** بریتی لە دڵ سووتان و دیتنی مەرگی ڕۆڵە.

**چۆڵەپێچ:** پشتبەستی درگا، دارێکە بۆ داخستنی دەرگا لە دیوی ناوەوە

**خەنیم:** نەیار، دژ، دوژمن

**دابەڕزین:** هێرش بردن، هۆمەن بردن (خوێن بەرەو سەری دادەبەڕزێ)

**داڵدە:** پەنا

**داڵدەدان:** پەنادان، چەپاڵەدان

**دژکام:** تەرکەدنیا، کەسێک کە خۆشییەکانی دنیا لە خۆی حەرام دەکا.



**دژوێن:** جنێو، جوێن، دژمان، سخێف، دژوون

**دەرۆزەکەر:** سواڵکەر،پارسەک

**ڕشقنجاڕ:** گاڵتەجار

**ڕمموودە:** ئالوودە، خووپێگرتوو

**سەروپێچکە:** منداڵی ساوا و مەلۆتکە کراو.

**سۆتە:** بێدین، کافر، تاوانبار

**سەرامە:** سەرامەت، بەرچاو و دیار لە نێو خەڵکدا

**سەرباشقە:** سەرتۆپ، هەڵکەوتە لە نێوان چەند کەسدا و ئازاتر و تێگەیشتووتر لە ئەوانی تر.

**فهێت:** شەرم، حەیا

**قسقانج:** جورێک قالۆنچەی وەک کۆ وایە ئێواران بۆ لای ڕووناکایی دەفڕێ.

**قوڕساخ:** مەند و ماقووڵ، بەویقار

**کاڵفام:** گەمژە، حەپۆل

**کەلبەدوون:** پەراوێزی بەزەڕی گوڵدۆزی کراوی عەبا و کەوا

**گەڕۆک:** گەڕاڵ، کەسێک کە هەمیشە لە حاڵی گەڕاندایە.

**نقشک:** ڕۆنەکەرە.

**هەڵەموت:** هەڵدێر، هەڵەت (پرتگاه)

## بەرهەمی بڵاوکراوەی وەرگێڕ:

١. تاپۆی وەرزێکی سەوز، شیعر، ١٩٩٧

٢. شەوەژانی ئەستێرەیەک، شیعر، ٢٠٠٠

٣. مەرگەخەون، شیعر، ٢٠٠٣

٤ـ دیسان لەو شەقامانەوە، کۆچیرۆکی بیژەن نەجدی، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٥

٥. تەپڵی ئاور، کۆچیرۆکی بیانی، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٥

٦. جێگەی بەتاڵی سلووچ، ڕۆمان، مەحموود دەوڵەتئابادی، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٦

٧. خۆر و لاولاو، کۆشیعری منداڵان، ٢٠٠٧

٨. برایانی کارامازۆف، ڕۆمانی داستایۆڤسکی، وەرگێڕان ٢٠٠٧

٩. یەکگرتن، چیرۆکی منداڵان، قودسی قازی نوور، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٧

١٠. خولیای نووسین، ڕەزا بەراهەنی، کۆمەڵەوتار، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٨

١١. فەرهەنگی ڕێژگە (ئەو وشانەی لە هەمبانەبۆرینەدا نین)، ٢٠٠٩

١٢. کەڵەشێری ورگن، گێڕانەوەی چیرۆکێکی فۆلکلۆر، ٢٠١٠

١٣ـ تازیەبارانی بەیەل، ڕۆمان، غولامحوسێن ساعیدی، وەرگێڕدراو، ٢٠١٠

١٤. ئاناکارنینا، ڕۆمان، لیۆن تۆلستۆی، وەرگێڕدراو، ٢٠١٠



**ئەم بەرهەمانەش ئامادەی چاپن:**

١. نارنجیفڕین، کۆچیرۆک

٢. دار و پەپوولە و ڕووبار، چیرۆکی منداڵان، فەریدە شەبانفەڕ، وەرگێڕدراو

٣. سترانی شەپۆلەکان، شیعری هاوچەرخی فارسی، وەرگێڕدراو

4- ڕێگایەک بەرەو هەتاو، کۆچیرۆک، وەرگێڕدراو

٥. ئەرباب و نۆکەر، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕدراو

٦. باوە سیرگی، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕدراو

. دیلی قەفقاز، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕدراو

. مەرگی ئیڤان ئیلیچ، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕدراو

. ئاپۆرەی خەو، کۆمەڵە شێعر

. زایەڵەی شاخ و قیژەی گوڵەباخ، کۆمەڵە شێعر

. هاوار و ژیلەمۆ، کۆمەڵە شێعر

سەرچاوە: باوە سێرگی، لیو تولستوی، ترجمەی شروش حبیبی، چاپ اول، پاییز تهران نشر چشمە